

لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما

زنجیرەی(١١٢)

سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی چاپی کتێب

ئیسماعیل کوردە، ڕێبین ڕەسوڵ

ناوی کتێب بەکوردی: سێبەری وشە

نووسەر: سەدیق سەعید ڕواندزی

بابەت: کۆمەڵە وتار

دیزاین: نما

بەرگ: سەرکەوت وەلی

تیراژ: ٥٠٠

چاپ: چاپخانەی شەهاب

چاپی یەکەم: کوردستان/ هەولێر ٢٠١١

نرخ: ١٥٠٠ دینارە



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی ساردنی" ٧٥٢" ٢٠١١ی پێدراوە.

## ناومرۆك

# وشەیەك

خوێنەری بەڕێز / ئەم چەند وتارەی لە دوو توێی ئەم پەرتووکە دایە بەشێکی بچوکن لە کۆکراوەی دەیان وتاری تر کە سالّی رابردوولەرۆژنامەو گۆڤارەکان بلاّوکراونەتەوە، بەلاّم من تەنیا ئەو چەند وتارەم هەلّبژارد کە بشێن لە ناوەڕۆکی پەرتوکێکدا کۆیکرێنەوەو ناوم ناون سێبەری وشە بەو مانایەی کە وتارەکان لە ڕووی ناوەڕۆك و ڕەهەندی مانایەوە لە یەکتر دوورن بەلاّم تاکە شتێك کە بەیەکتریان دەبەستێتەوە وشەیە. بەو هیوایەی جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران بێت.

سەدیق سەعید رواندزی

رواندز/هاوینی ۲۰۱۱

# نووسین لە نێوان
# زمانی (بازاڕ)و زمانی (مەعریفە)دا

یەکێك لەو فاکتەرانەی وایکردوە بە شێوەیەکی گشتی دنیای نووسینی ئێمە لە دوای راپەریندا کەمترین رووبەری هەبێت بۆ بەرهەم هێنانی مەعریفە(بە چاوپۆشین لە هەبوونی چەند دەنگێکی داهێنەر بۆنموونە وەك رەهەندییەکان)رەنگە پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە تا ئەندازەیەکی ترسناك نووسین وەك تێزێکی فیکریو مەعریفی کە هەڵگری پەیامێکی زانستیو مرۆییە بچوكو بێنرخو کاڵکراوەتەوە بۆ قسەکردنێکی بێ بە هاورووتی کۆمەڵایەتیانەی رۆژانە بە رادەیەك کە لە هەندێ کاتدا نووسینێك دەبینین هەڵگری هەمان ئەوزمانو ئاماژەو دەربرینانەیە کە لە چوارچێوەی ژیانی کۆمەڵایەتیانەی رۆژانەی مرۆڤەکان هەیە. بگرە هەندێ کات بێ بە هاتریشە. کاتێ جیاوازیش لە نێوان زمان وەك ئامرازی نووسینو زمان وەك ئامرازی قسەکردنو پەیوەندی کۆمەڵایەتیانەی سادە نەما، ئیدی بێگومان شتێك ئامێنێتەوە بە ناوی مەعریفە لە نووسیندا. چونکە دواجار ئەوەی دەبێتە بەر مەبنای بەرهەم هێنانی مەعریفە و فیکر لە نووسیندا خودی ئەو زمانەیە کە پێی دەنووسرێت، کەزمانیش خاڵیو لاوازو بێ موفرەداتی مەعریفی بووبەماناي وایە دواجار خودی نووسینەکەش لاواز دەبێتو خاڵی دەبێتەوە لە هەر جۆرە ئاماژەو پەیامێك. لە راستیدا کۆمەڵگای کوردی بە بۆچوونی من لە هیچ هەڵومەرجێکی ژیاریو رۆشنبیری وەك ئەمرۆیدا ئەوندە گیرۆدەی زمانی ئەشهیرو یەکتر سرینەوەوناشرین کردنو بێ نرخکردنی یەکتري نەبوە. بە درێژایی مێژووی ئەدەبیاتو دنیای نووسینی کوردی قەت وەك ئەمرۆ ئەوندە تێکستێك نییە کە زمانی (بازار)ی بە سەردا زاڵبێتو پایەکانی لەسەر سرینەوەو بێ ئاکاری کۆمەڵایەتیو

پەروەردەییەوە بێتو  لەدەرەوەی زمانی مەعریفەوە بێت. بەدەگمەن لە گوتاری شیعری کلاسیکی کوردی کە چەندین سەدە بە رلە ئێستا نووسراونو رەنگدانەوەی هەڵومەرجێکی کۆمەلأیەتی یە کجار دواکەوتوە، بە بەراورد لەگەڵ ئێستا شیعرێك دەبینین کەلەدەرەوەی زمانی مەعریفەو  لۆژیك بێت، بە چاوپۆشین لەهەبوونی یەك دووشاعیری هەجوو کەچەند شیعرێکیان هەیەو بە فۆرمێکی ناوازەوبە زمانێکی سادەورووت باس لە سێکسو  بونیادی بایۆلۆژی مرۆڤ دەکەن بۆنموونە وەك شیعری(شیخ رەزا).  دەنا زمانی شیعری کلاسیکی کوردی زمانێکی بابەتیو  لۆژیکیو عیرفانیو تەنانەت فیکریو مەعریفیشە.  ئیمە کاتێ مەوداکانی زمان لەو قۆناغە هزریو  رۆشنبیریەی کۆمەڵگای کوردی بەنموونە بەراورد دەکەین لەگەڵ هەڵومەرجی ئێستای رۆشنبیری کوردی ئەوسا دەزانین لە بەردەم چ  وێرانەیەك داین بەناوی گوتاری نووسینو  مەعریفەوە.  تێدەگەین کە لەئێستادا بچوکترین سنوور لەنێوان نووسینو  قسەی نێودانیشتنە کۆمەلأیەتیە رووتەکانی کۆمەڵگای کوردی نەماوەتەوە.کاتێ هەموونەو چەمكو  دەستەواژەو دەربرینانە وەك سامپلێك لە هەندێ تێکستی بە ناو نووسینی کوردی ئێستا وەردەگرینو بەراوردیان دەکەین لەگەڵ پانتایی دەربرین لە گوتاری ئەدەبیاتی چەندین ساڵ بەر لە ئێستا رەنگ درك بەوە بکەین کە لە زۆر رووەوە زمانی نووسینی کوردی لەو سەردەمدا بە بەراورد لەگەڵ ئێستا زۆر بابەتی ترو  ئستاتیکی تر بوە.  ئەمە لە کاتێکدا کۆمەڵگای کوردی لە ئێستادا بە چەندین فرسەخ لە پێش ئەو کاتەوەیە.  بەلأم مەرج نییە لە هەمووسەردەمێکدا داهێنانو نوێکاری بەرهەمی ئازادی رەهابنو  مرۆڤ بتوانێت بەر مەبنای بوونی ئازادیو  سەربە خۆیی سیاسی داهێنان بکاتو  تێکستی پڕ مەعریف بنووسێت،  بۆنموونە (نازم حیکمەت)ی شاعیرو  ئازادیخواز لە زینداندا جوانترین تێکستی لە بارەی چەمکی (ئازادی)ەوە نووسیوە.   ئەمە لە کاتێکدا زیندانیش بوو. کەواتە داهێنانی هزریو  نووسینی پر لە فیکرو مەعریفە پەیوەندی بە رادەی هوشیاریو  دنیابینی بەرفراوانی نووسەر

خۆیەوە هەیە. دواجار کۆنتاك دەکرێت لەگەڵ ژینگەی بابەتی دەوروبەر. لە پەراوێزی ئەمەشەوە دەبینین کە راپەرینو ژیانی ئازادی دوای ئەو قۆناغەی کۆمەڵگای کوردی ئەوندەی بوە زەمینەیەك بۆ سەرهەڵدانو دروست بوونی زمانی سرینەوەو بێ بە هاکردن بە سوود وەرگرتن لە ئازادیەکە، ئەوندە نە بوە زەمینەی بیناکردنی زمانی لۆژیكو فیکرو مە عریفە.

بەداخەوە یەکێك لەو دیاردە رۆشنبیریە نێگەتیڤانەی لە دوای راپەرینەوە بە شێوەیەکی گشتیو لەو چەندساڵانەشدا بە شێوەیەکی تایبەتی لەنێو ئێمەدا دروست بوە، دیاردەی زۆربوونی چاپو بڵاوکردنەوەو دەرکردنی رۆژنامەو گۆڤارە. بە بێ هەبوونی هیچ فلتەرێكو سانسۆرێك. بەرادەیەك کە گەرەلاوژێی لەو شێوەیە لە هیچ کۆمەڵگایەکی تر بوونی نییە. ئەم دیاردەیە لەگەڵ سەرهەڵدانو دەرکەوتنیدا بە داخەوە زەمینەی ئەوەی رەخساند کەوا لە شکرێکی قەڵەم بەدەست بێتە ئاراوە کە ئەرکیان تەنیا فڕێدانی وشە بێت بە بێ هیچ لێکدانەوەیەکی هزریو کۆمەڵایەتی. بە دەربڕینێکی تر ئەم دیاردەیە وایکرد کەنووسین بە (پیشەیی) بکرێت بەو مانایەی وەك هەر پیشەیەکی دیکەی ژیانی مرۆڤەکان ئاسایەو رێی تێ دەچێت هەموو کەسێك بنووسێتو پراکتیزەی دنیان نووسین بکات. لە کاتێکدا هەمووومان دەزانین نووسین هەرگیز پیشە نییە، بەڵکو داهێنانو بەرپرسیاریەتیو کردارێکی هزریو زانستییە. بێگومان کاتێ نووسینیش کرا بە پیشە( وەك هەرپیشەیەکی تر) ئیدی سنوورێکی سەنگرانەوە سلکردنەوە نامێنێتەوە بۆ دەربڕینە وشە. کە ئەو سنوورەش نەما بەدڵنیایەوە کەسانێك چۆنیان بوێتو چی مەبەستیان بێت دەتوانن ئەوە بکەن، لێرەوەش ئێمە دەبینین لە هەڵومەرجی ئەمرۆماندا چەندین بە ناو نووسین دەخوێنینەوە کە بەبێ هەبوونی هیچ فلتەرێکی زمانەوانیو بابەتیو تەنانەت زانستیو فیکریش دەنووسرێنو لەوە کارەساترو تراژیدی تریش ئەوەیە بواری بڵاوکردنەوەیان پێ دەدرێت. تەنانەت لە زۆر کاتدا لە هەندێك نووسین چەمكو دەستەواژەی وا هەیە کە هەرگیز کەسانی ئاساییش لە چوارچێوەی فۆرمی کۆمەڵایەتی ژیانی خۆیان بە کاری ناهێنن، چ جای

بخرێنه چوارچێوەی تێزێکی مۆراڵی‌و پەروەردەیی گرنگەوە کە ئەویش نووسینە. بە سەرنج دانمان بۆ چەندین وشەی وەك( چەقوکێش_ بۆکس وەشێن_ منا لباز_. بێ رەوشت_ جەردە_ دز. . . تد کە لە هەندێك بە ناونووسینی کوردی گەلێك جار دەکەوێتە بەرچاومان بە تەنیا بەسن بۆ ئەوەی بروا بێنین کە ئێمە لە بەر دەم چ وێرانەیەك داین بە ناوی نووسین‌و رۆشنبیریەوە. رامان لە ئاست ئەو دەستەواژە نامۆو بێ بەهاو بێ نرخانە لە نووسینی کوردیدا ئاماژەیەکی ترسناکە بەوەی کە ئێمە لە بەر دەم چ شێوە زمانێك داین کە هەڵگری بچوکترین ئاکاری رۆشنبیری نییە. هەڵبەتە کە زمانیش بارگاوی کرا بە چەمك‌و دەستەواژەوئاماژەی توندو نەشیاوو نارۆشنبیری بە تایبەتیش لە نێو نوخبەیەکدا کە ئەرکیان هوشیارکرنەوەو نوێکاری‌و گۆرانکاریەو دەبێ پێشەنگی گۆرانکاریەکانی کۆمەڵگابن، ئیدی بێگومان رووبەرێك نا مێنێتەوە بۆ دیالۆگ‌و بیرورا گۆرینەوەو کلتوری هەڵکردنی ئاشتیانە ی بە یەکەوە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا. لە راستیدا بە شێکی هەرەزۆری کلتوری توندوتیژی‌و زمانی زبرو یەکتر سرینەوەورەخنەی نامەنتقی کە لە گوتاری رۆشنبیری کوردی دوای راپەریندا سەری هەڵدا دەرەنجامی گواستنەوەی دیاردەی توندوتیژی بوولە کایەی کۆمەلآیەتی بۆ کایەی زمانەوانی. بەو مانایەی زمان لە بری ئەوەی رۆلی هێورکرنەوەودروستکردنی کەشی بە یەکەوەبوون لە کۆمەڵگادا برە خسێنێت، بە پێچەوانەوە دەبێتە میتۆدێك بۆ قولکردنەوەی ناکۆکیەکان‌و رەخساندنی زەمینەی سرینەوەی ئەوی بەرامبەر. ئەو فۆرمە لە گوزارشتکردن‌و دەربرینی زماندا درێژکراوەی شەری سیاسی نێوان حزبەکان‌و پاشماوەی بە ..ماوی کلتوری شەری براکوژی نێوان حزبە کانە. بۆیە ئێستاش وێرای زەمەنێکی درێژ لە کاڵبوونەوەی شەری ناوخۆ کەچی دەبینین کاتێ بچوکترین رووبەروبونەوەو بە یەکداهەڵشاخان لە نێوان هێزە سیاسیەکان دروست دەبێت هەمان ئەو شێوە زمانە خۆی نمایش دەکاتەوە. دیار مەبەستی ئێمە لەوەدا ئەوە نییە کەهەرچی لاوازی زمانی کوردی هەیە بیدەینە پاڵ سیاسەتەوە، بەلآم ئەوە راستیەکەو دەبێ ئاماژەی پێ بکەین.

چونکە وەك چۆن کۆی کایەکانی ژیانی ئێمە سیاسەت بەسەریەوە زاڵە، بەهەمان شێوە زمانەکەشمان رە هەندێکی سیاسیانەی بە خۆوە گرتوە. هەڵبەتە، جێگەی داخە کە ئەو بە بازاریکردنەی زمانی نووسین‌و دەربرین لە بە شێك لە پانتایی نووسینی کوردیدا، دیاردەیەکی رۆشنبیری ناوازەیە و دەبێتە بەشێکی ناشرین لە مێژووی نووسینی کوردیدا. بەلایەنی کەمەوە بە رپرسیاریەتێکی مۆراڵی‌و کۆمەڵایەتی‌و پەروەردەی گەورە بۆ هەمووممان دروست دەکات لە پێشەوەشیان رۆژنامەو گۆڤارو چاپ‌و بلاّوکراوەکان. چونکە کارەسات ئەوەنییە، کەسێك بە ناوی نووسین‌و بلاّوکردنەوە هەرچی بە خەیاڵی داهات لە ورێنەو قسەی بێ مان بینووسێت. رەنگەناستی تێگەیشتن‌و مەودای رۆشنبیری ئەو کەسە هەر ئەوەندە بربکات. بە لاّم شیاوو رەوانییە بە ناوی ئازادی رادەبرینەوە زەمینەی بلاّوکردنەوەی بۆ برە خسێنرێت‌و لە شوێنێك بلاّوی بکاتەوە. ناکرێت رێگە بدرێت لە پەنای ئازادی رادەربرینەوە، یاخود شوناسی بەناو رە خنەییەوە ئازادی کەسانی تروسایکۆلۆژیەتی مرۆڤەکان بریندار بکرێت. بۆیەشە ئەرکی بلاّوکراوە حزبی‌و ئەهلیەکانیشە، سانسۆر بێخنە سەر هەر نووسینێك کە تیایدا سنووری ئازادیەکان‌و ئادابی گشتی دەبە زێنێت. . ئازادیەکانی مرۆڤ لەو کاتەدا نرخ‌و بەهاو گرنگی هەیە کە تیایدا ئازادی کەسانی تریش پێشێل نەکرێت. ئەمە لە لایەك لەلایەکی ترەوە ئەرکی هەموومانە جارێکی تر نرخ بگێرینەوە بۆ تیژی نووسین‌و لە چەندین کەناڵەوە کاربکەین بۆ جیاکردنەوەی زمانی بازار لەزمانی مەعریفەو فیکردا. چونکە ئەگەر گوتاری نووسین جیانەکراوە لە قسەی بازاری‌و نێو دانیشتنە کۆمەڵایەتیەکان ئەوا بێگومان چەمك‌و دەستەواژەی نەشیاوونامۆتری لەو شێوەیەش خراپترو بێ ماناتریش دێنە ئاراوە. . . .

*لەژمارە(٥٧)ی رێگای ئەدەب‌و هونەری رێگای کوردستان رۆژی١٣/٤/ ٢٠١١بلاّوکراوەتەوە. . . .

# ئەنفال پرۆژەیەك بۆ سرینەوەی ژیان

جێگەی داخە تاکو ئێستاش یادەوەری ئێمە بۆ ئەنفال، هێندەی یادەوەریەکی مێژوویە، یادەوەریەکی ئێستایی نیە. مێژوویی بەو مانایەی کە ئێمە تەنها لە رۆژێکی دیاریکراودا کە چواردەی نیسانە، ئەو کارە ساتەمان دێتەوە یاد. ئەمە راستیەکی تاڵەو دە بێ دانی پێدا بنێین. لە کاتێکدا دەتوانین بڵێین دیارترین کارەساتی ئێمە کە نابێتە بە شێك لە رابردوو ئەنفالە. چونکە ئەم کارە ساتە هەر تەنها تراژیدیای کۆمەڵێ مرۆڤی لەدەست چوومان ناهێنێتەوە یاد، بە لکو تراژیدیاو ناسۆری هەموو ئەمانەشمان پیشان دەدات کە دوای ئەوکارە ساتە بە زیندووی ماون و رۆژانە لە تەوێڵیانەوە خەمە قوڵە کانیان دە بینین. بە دەر برینێکی تر ئەنفال وێرای بە سە رچوونی زەمەنێك لە روودانی کە چی هێشتاش کاریگەریەکانی هەرماون و ناسەوارەکانی بەرچاون. هەرئەمەشە وادەکات کە یادەوەری ئێمە لەگەل ئە نفال نە پچرێ. چونکە بەردەوام کەس و کاری ئەنفال کراوەکان و رزگاربوانی ئەو کارەساتە گەورەیە رووداوەکەمان دێنێتەوە یاد. لە مێژووی خەبات و تێکۆشانی خۆیدا کورد وەك نەتەوەیەك رووبەرووی چەندەها کارە ساتی تراژیدی و ئەهامەتی گەورە بۆتەوە، وەلێ لەگەڵ ئەمەشدا ئەنفال دیاریترین ئەو کارەساتەیە کە ئێستاشی لە گەل دابێت خوێنی لێدەتکێ، ئەنفال هەرتەنها رووداوی لە دەستدانی کەسە نزیك و نازیزەکانمان نیە بەڵکو کارەساتی مرۆڤە زیندوەکانیشە کەلە دوای ئەو کارە ساتە ماون و مەودایەکی گەورە لە ژیانیان وێرانکراوەو پێویستیان بەوەیە سەر لەنوێ ژیان دەست پێ بکەنەوەولەو رەهەندە مەرگدۆستیە دەربچن کەبەردەوام

لەدەرەنجامی ئەو کارەساتە لەگەڵی دەژین. ئەنفال کارەساتێکە ئەوندەی پێویست دەکات دڵنەوایی زیندوەکانی بدەین‌و ماناکانی ژیانیان بۆ بگێرینەوە ئەوندە پێویست ناکات لە خەمی مردوەکانیان دابین. بەو مانایە نا کە لە بیریان بکەین. بێگومان هەموومان دەزانین ئەنفال ئەو پەلامارە سەربازیە گەورەیەو هەمە لایەنە بوو کە لەمانگی شوبات تاکو کۆتای ئابی ساڵی هەشتاوهەشت لە لایەن رژێمی بە عسەوە بە هەشت قۆناغ بەرامبەر گەلی کورد ئەنجام درا. سەرەتاش لەدۆڵی جافایەتیەوە دەستی پێکردولە دهۆك کۆتایی هات. ئەم پەلامارەی رژێمی بە عس هەر تەنها رەهەندێکی سەربازی نەبوو بەڵکو بەشێك بوو لە پیلان‌و سیاسەتە شۆفێنیەکانی بە عس کە ئامانجی سەرەکی تیایدا سڕینەوەی ژیان‌و وێرانکردنی کەسیەتی مرۆڤی کوردومێژوو جوگرافیاو خاك‌و ناژینیش بوو. بەو پێیەی هەموو ئەو لایەنانەی ژیان لە ئەنفالدا دەکەونە بەر هێرشی لە ناوچوون. ئەگەرچی لە شالاوی ئە نفالدا مرۆڤی کورد ئامانجی یەکەم‌و سەرەکی ئەو لە ناو بردنەیە، وەلێ هاوشانی ئەمەش خاك‌و بونیادی سروشتی‌و مەزارە ئاینیەکانیش وێران دەکات. واتە هەموو بزاوت‌و جولەیەکی ژیان لەو ناوچانەدا هەرەس پێدێنێ‌و لە کۆتاییدا سەر زەمینەیەکی وێران‌و ئاشوب لە دوای خۆی جێدێلێ. بێگومان یەکەم توخمی ژیان لە کۆمەڵگای کوردیداکە دەکەوێتە بەر شالاوی ئەنفال خێزانی کوردیە کە تا ئەوسات لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیانەی سادەو ساکار ژیانی دەگوزەراند، بەڵام ئەنفال دێت رایەڵەکانی ئەو ژیانە تێکدەدات‌و بەشێوەیەك لە شێوەکان خێزانی کوردی وێران دەکات کە لە لایەکەوە بە شێك لە ئەندامەکانی شوێن بزر دەکات‌و لە بیابانەکانی باشور زیندە بە چاڵیان دەکات، لە لایەکی تریشەوە قە یرانێك لە رووی سایکۆلۆژی‌و کۆمەڵایەتیەوە بۆیە شێکی تریان ئەوانەی لە مەرگ رزگاریان بوە جێدێلێ. هەڵبەتە بە عس دەیزانی کە پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی نێو خێزانی کوردی چەند پەیوەندیەکی روحی‌و کۆمەڵایەتی بە تینە، ئیدی سەرەتا لە تێکدانی ئەو پەیوەندیەوە دەست پێدەکات‌و بەمەش

میکانیزمی یەکەمو سەرەکی پرۆژەی بەردەوامیەتی ژیان لە نێو دەبات کەمرۆڤە. دیارە ئەمەش بە دوو ئاستی جیاوە لەلایەکەوە بە شوێن بزرکردنی بە شێکیان لە لایەکی تریشەوە بەمانەوەی بە شێکی تریان لە نێو دۆخێکی سایکۆلۆژیو تراژیدی کاریگەر. لێرەوەش دەبینین هەموو ئەو کەسانەی لەو شالاوە بەدناوەدا رزگاریان بوە هەمیشە هە ست بە بۆشایەکی گەورە لەژیانیانو جۆرێ لە نامۆبوونی روحی دەکەن، کە قەرەبوکردنەوەیان ئەستەمە. دیارە ئەمەش دەرەنجامە ترازانی ئەو پەیوەندیە کۆمەلایەتیەی نێو خێزانی کوردیە (لەو ساتدا) کە باسمان کرد. ئیدی ئەوان بە لە دەستدانی بە شێکی زۆر لە کەسو کاریان بە شێکی گەورە لە ژیانیان دەرمێت کە بە هۆیەوە ئێستاشی لەگەڵ دابێت پێی دە تلێنەوە. چەندەها کێشەو گرفتیان لە رووی دەرونیو کۆمەلایەتیو ئابوریەوە بۆ جێدە مێنێ.
لە راستیدا ئەو شێوازە لە مامە لەکردنی بە عس بەرامبەر مرۆڤی کورد ئامارژەیەکە بۆ ئەوەی بە هۆیەوە ماهیەتی دە سەلاتێك بناسین کە تاچ رادەیەك مەرگدۆستەو ژیان وێران دەکاتو کوشتنی مرۆڤەکانی بە لاوە هەموو شتێکە، وێرای ئەوەی روانگەیەکی ئەو پەڕی شۆفێنی هەیە بۆ کە سانێکی جیا لە خۆی لەرووی شوناسەوە. هەڵبەتە دوای ئەنفالکردنی مرۆڤەکان بەعس هەنگاوی تر بۆ تێکدانی ژیان دەگرێتە بەر کە ئەمیش وێرانکردنو سوتماککردنی ژینگەی سروشتیو جوگرافیاو خاکی کوردستانە. واتە بە عس هەر تەنها بە لە نێو بردنی مرۆڤی کورد ناوەستێت، بەڵکو زەمینەی ژیانیش وێراندەکاتو هەموو ئەو بنەمایانەی ئەگەری ئەوەیان تیا بێت جارێکی تر ژیان نویێ بکەنەوە لە ناو دەبات.

دیارە دوای ئەو پەیوەندیە قوڵەی لە نێوان مرۆڤەکان هەیە لە بونیادی کۆمە ڵگای کوردیدا، پەیوەندە نێوان مرۆڤی کوردو خاکەکەی دێت کە ئەمیشیان دیسانەوە پەیوەندیەکی مێژوویی کاریگەرەو هەمیشە خاکی کوردستان لە دنیابینی مرۆڤی کورددا پیرۆزی خۆی هەبوە تا ئەو ئەندازەیەی کە بوونی خۆی لە بوونی خاکدا دە بینێتەوە. دیارە بەو پێیەی مرۆڤی کورد

هەمیشە خاکەکەی داگیرکراو بوە لە لایەن دوژمنەکانیو قەوارەیەکی سەر بەخۆی نەبوە، ئیدی بەبەردەوامی هەستی بەلەدەستدانی یەکێ لە بە ها هەرە پیرۆزەکانی ژیان کردوە کە نیشتمانە. بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەی هەموو جۆرە فیداکارییو شۆرشو تێکۆشانێك بوە. لەم روانگەیەوە کاتێ دەسەلاتی بەعس درك بەو پەیوەندیەی نێوان مرۆڤی کوردوخاکەکەی دەکات، ئیدی دەست دەکات بە پرۆسەی وێرانکردنی خاکی کوردستانو تێکدانی لادێکانو سووتاندنی رەزو کێلگەو کارێزو. . . تد دەبێ بزانین بەعس هەر تەنها لە بێ ئاگاییو تەواوکردنی هێرشە سەربازیەکانی ئەمەی نەکردوەبەلکو بە پلانو ئامانجێکی دیاریکراوکە پێشتر نەخشەی بۆ کێشراوە ئەنجامی دەدات. بەعس دەیتوانی بەتەنها مرۆڤەکان ئەنفال بکاتو دێهاتەکان نەسووتێنێ، بەلاّم کاتێ هاوشانی مرۆڤ شوێنیش خاپوور دەکات ئیدی زەبرێکی کوشندە لە سایکۆلۆژیەتی مرۆڤی کورد دەدات و هەمیش پرۆسەی وێرانکردنی ژیان لە ئاستێکی فراوانتر پراکتیزە دەکات کە بە شێکی دیکەیە لە تەواو کردنی ژیانی مرۆڤ. دیارە دوای هەردوو رەگەزی(شوێن/ مرۆڤ) بە عس لە رێی شالاّوی ئەنفالەوە بەردەوام دەبێت لە وێرانکارییو تەجارەیان پەلاماری شوێنە ئایینیەکان دەداتو پاشماوە شارستانییو فەرهەنگییو ئاسەوارە مێژوویەکان لەناو دەباتو دەیان سرێتەوە. هەموومان دەزانین کە بە سەدان مزگەوتو چەندان شوێنەواری مێژووییو فەرهەنگی کۆمەلّگای کوردی کەوتنە بەر ئەو شالاّوەولەناوچوون. هەموئەو توخمانەی باسمان کردن بونیادی نەتەوە پێکدەهێننو بەشێکی هەرە سەرەکیو پربە هاى هەر گەلو نەتەوەیەکن بەلەناوبردنی ئەمانە هەموو ئەو رایەلاّنە لەناو دەچن کەنەتەوە لە مێژوو لەرابردوودا رادەگرن. واتە دەتوانین بلّێین ئەنفال پرۆسەیەکی سەربازی رووت نەبوە بەقەد ئەوەی هەولێکی کۆلۆنیالاّنە بوە بە ئامانجی لە نێوبردنی رایەلە مێژوویەکانی نەتەوەی کوردو توانەوەی لە بۆتەی نەتەوەی سەردەست. کاتێ نەتەوەیەك بنەما فەرهەنگییو کلتوریەکانی دەکەونە بەر هەرەشەی سرینەوەو نەمان

بێگومان پرۆسەی توانەوەی نەتەوەی دەست پێدەکات‌و هەموو ئەو ئاماژە مێژوو یانە لەناو دەچن کە دەلالە تێکن بۆ بوونی ئەو نەتەوەیە. بە بۆچوونی من بە درێژای ستەمەکانی بەعس لە عیراقدا بەرامبەر نەتەوەی کورد، بەتەنها ئەنفال بەسە بۆ ئەوەی نێمە رادەی درندەیی‌و خوێنرێژی‌و دیدی شۆفێنیانەی بەعس بەرامبەر گەلی کورد بناسین. ئەمە هەر تەنها لە بەر ئەوە نیە کە سەدان مرۆڤی ئێمە بێ سەرو شوێن دەبن. بەڵکو تێنوەتی بەعس بۆ خوێن رشتن‌و نامانجەکانی بەمەبەستی هەڵتەکاندنی نەتەوەی کورد لە ئاستی بووندا نیشان دەدات. وێرای ئەمانە لە هەمووی کوشندەتروترسناکتر ئەوەیە کە بە عس لە رێی پرۆسەی ئەنفالەوە کۆمەڵگای کوردی لە هێزێکی مرۆیی زیندووی بەرهەم هێنەوەگۆری بۆ هێزێکی بەکاربەر. چونکە ژێرخانی ئابوری لادێکانی کەلە کشتوکاڵ‌و ئاژەڵداری پێك هاتبوو وێرانکردوو دانیشتوانی ئاخنیە کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکان کە سەرەتاییترین‌و سادەترین مافی ژیانی تێدا نەبوو. جگە لەوەی کە ئەو کۆمەڵگا نیشتە جێیە زۆرە ملێیانە لە شوێنێك دروست کرابوون کە کاریگەریەکی ئەوتۆی هەبوو بۆسەر دەروونی مرۆڤەکان کە بە هۆیەوە چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی دروست دەبوو. هەموو ئەو لایەنانە بە سەر یەکەوە بوونە هۆی ئەوەی بە شێکی زۆری جوگرافیای کوردستان وەك زەمینەیەکی وێرانبووی بێ جوولەوبزاوتی ژیان لێبێت‌و خامۆشیەکی کوشندە باڵ بەسەر کوردستان دابکێشێ. بێگومان ئەو دۆخە سامناکەی کەدەرەنجامی پرۆسەی بەدناوی ئەنفال کوردستانی گرتەوە، مەودایەکی زەمەنی زۆری نە خایاندووسێ ساڵ دواتر بلێسەی راپەرین کوردستانی گرتەوەو تێکرای شارو شارۆچکەکانی کوردستان لە ژێر چرنۆکی ئەو دەسەلاتە شۆفێنیە رزگار کرا کە ئەنفالی ئەنجامدابوو. لێرەدا دەکرێ بپرسین ئاخۆ بە درێژای ئەو ساڵانەی راپەرین‌و دوای ئەنفالەکان چی بۆ کەس‌و کاری ئەنفالەکان کراوەو چیان بۆ بکرێت، ئایا توانراوە برینی ئەنفال سارێژ بکرێت‌و بە لایەنی کەمەو هەوڵی ئەوە بدرێت تارادەیەکی کەم هەموو ئەو

بۆشایە دەروونی‌و روحیانە پڕبکرێنەوە کە بە هۆی ئەنفالەوە تاکەکان گیرۆدەی بوونە؟

دیارە کەم تا زۆر دەسەلاتی کوردی هەولیداوە لە کێشەو گرفتەکانیان کەم بکاتەوە، وەلێ دەبێ ئەوە بزانین کە ئەنفال کارە ساتێکە ئێمە هەرچیەك بکەین ناتوانین بە شێکی بچوکی ئەو کارەساتەش پربکەینەوە. دەبێ زیاترو بەر فراوانتر بچینە نێو کێشەو گرفتو داخوازیەکانی خەلکی رزگاربووی دوای ئەم کارەساتە. بۆئەم مەبەستەش نابێ هەر تەنها دلنەوایی ئەو مرۆڤانە بدەینەوە بەوەی کە خانوێك یان موچەیەکی خانە نشینی یانیش یا دکردنەوەیەکی سالانەیان بۆ ساز بدەین. بە پێچەوانەوە بە هیچ شێوەیەك خوێنی مرۆڤ نانرخێنرێت بەرامبەر هیچ سەرمایەیەك. بەلکو دەبێ هەولبدەین لەرووی سایکۆلۆژی‌و کۆمەلایەتی‌و بونیادی ژیانەوە خەمەکانین کەم بکەینەوەو جارێکی تر پیرۆزی ژیانیان بۆ بگێرینەوەولەو دۆخە رەشبینی‌و نامۆییە رزگاریان بکەین کە بە هۆی ئەو کارە ساتەوە تووشی هاتوونو ئێستاش پێیانەوە دیارە. بۆئەوەی ئەم کارەش بکەین هێندەی پێویستە دلنەوایان بکەین لە رووی سایکۆلۆژی‌و سۆسیۆلۆژیەوە هێندە پێویستیان بەوە نیە پاداشتیان بکەین، ئەمە بەو مانایە نیە کە هیچیان بۆنەکرێت پێ نەدرێت. بەلکو لەو روانگەیەوە کە بتوانین ژیانێکی ئاسودەو بە ختەوەریان بۆدەستەبەر بکەین تاکو هەست نەکەن کۆمەلە کە سێکیان لە دەستداوە. دەبێ ئێمە ببینە جێگرەوەی دایكو باوك خوشكو براکانیان. دەبێ کەشێکیان بۆبرەخسێنین کە هیچ کاتێك وانەزانن لە خەمێکی گەورەو قول دەژین.

تێبینی /لە رۆژنامەی ئالای ئازادی ژمارە(٦٩٦)لە ٢٠١١/٤/١٣ بلاوکراوەتەوە. -

## بەڵگەكانتان بخەنەروو، ئەگەر ئێوە راستگۆن!

لە دوای راپەڕینەوە بە شێوەیەكی گشتیو ، لەم چەند ساڵانەی دواییشدا بە شێوەیەكی تایبەتی، رەوتێك لە نووسەرانو شێوازێك لەنووسین لە دوو توێی نێوەندی رۆشنبیریی كوردی سەری هەڵداوە كە بە تێگە یشتنی خۆیان راڤەی ئاین لە سەر میتۆدێكی زانستی دەكەنو رەخنە لە دیاردە ئایینیو شەریعیو تەنانەت گەردوونیەكانیش دەگرنو لەهەندێ باردا توندتریش دەرۆنو دەیانەوێت قسەلەسەر گوتەكانی پەروەردیگاربكەنو بە شێك لە چیرۆكەكانی نێو قورئانی پیرۆزبە ئە فسانە بناسێنن. هەموو ئەم كاركردنەشیان گوایە لە پەراوێزی ئەوەدایە كە ئاین بكرێتە كایەیەكی سەربەخۆو لە كۆمە لگا جیا بكرێتەوە. یان بە دەربرینێكی تر كۆمە لگایەكی علمانییو مۆدێرنمان بۆ بونیاد بنێن. وەك ئەوەی كۆمە لگای علمانی بە قسە وتن بە ئاین بە خواو بە قورئانو پە یامبەران بێتە دی!. كێشەكە لەوەدا نییە رەوتێكی لەو شێوەیە سەر هەڵئەداتو مە بە ستیانە تێزە بەناو رەخنە یی‌و فیكریەكانی خۆیان لە هەمبەر ئایندا پراكتیزە بكەنو لەژێر شوناسی رەخنەگرتن لە ئاین رەخنە لە خوداو قورئانو هەموو شتێك دەگرن، بەلكو كێشەی سەرەكی لەوە دایە ئەوان دەیانەوێت بە خوێنەوەیەكی رووكە شیانەو هەژارانەو خاڵی لە هەموو مە عریفەیەك ئەو پرۆسە بەناو رەخنەیە ئەنجام بدەن. جێگەی داخە زۆرجار ئەو دنیابینیە بەناو رەخنەییە دەگاتە ئاستێكی هێندە نزمو كۆمیدی كە تیایدا رەگەز دەدەنە پاڵ خوداو ئیسراو میعراج بە ئەفسانە دەزاننو سەرگوزشتەی ئادەمو حەوا بە شێوەیەكی تر دە بیننو یا خود دەڵێن حەوا پێشی ئادەم دروست بوەو دەیان راڤەو بۆچوونی تری بێماناو بێناوەرۆك كە تیایدا خوێنەر ناچارە

به تیژه کانیان پێبکه نێت. ئه‌و ره‌وته( گه‌رچی بچوکیشه) پێمان نالێن به پشت به‌ستن به‌کام به‌ڵگه‌ی زانستی‌و بابه‌تی‌و مه‌عریفی تیژه‌کانیان راسته ؟ ئه‌گه ر نووسه‌رێك دنیابینیه‌کی هێنده نازانستی هه‌بێت‌و لای وابێت حه‌وا پێشی ئاده‌م دروست کراوه، زه‌حمه‌ت نه‌بێ پێشمان نالێی به پێی کام ئایه‌ت‌و سوره‌تی پیرۆز وایه؟ ئه‌گه‌ر که سانێك هێنده کالّفام بن لایان وابێت خواش هاوشێوه‌ی مرۆڤ شوناس‌و ره‌گه‌زی هه‌یه پێمان نالێن به چ شێوه‌یه‌ك‌و چۆن‌و به کام به‌ڵگه‌ی زانستی‌و لۆژیکی قورئان وایه؟ تا به لایه‌نی که‌مه‌و ( به گاڵته) بروا به تیژه کانتان بهێنین‌و بێینه سه‌ر ره‌وتی فیکری ئێوه؟ وه‌لێ ئه‌وه‌ی جێگه‌ی سه‌رنجه ئه‌وه‌یه که ئه‌و ره‌وته نه‌ك هه‌ر ناتوانێ به ڵگه‌یه‌ك بهێنێته‌وه بۆ بۆچوونه‌کانی که تیایدا ٙراڤه‌ی دیارده‌کانی بوون‌و ژیان‌و قورئان‌و خودا له سه‌ر بنه مایه‌کی زانستی بکات. بگره خۆشیان چه‌واشه ده‌که‌ن به بێ ئه‌وه‌ی هه ستیشی پێبکه‌ن هه‌روه‌ك خوای په‌روه‌ردیگار له سوره‌تی به قه‌ره ئاماژه‌ی پێده‌دا. ئه‌وانه‌ی ده‌یانه‌وێت ره‌خنه له خوداو قورئان بگرن به تێگه یشتنی خۆیان، هێنده کۆڵه‌وارو هه‌ژارو بێده‌ره‌تانن توانای ئه‌وه‌یان نیه( مه حاڵه ئه‌و توانایه شیان هه‌بێت) له ژیانی بوونه‌وه‌رێکی بچوکی وه‌ك مێرووله یا جالجالۆکه وردببنه‌وه‌و راڤه‌ی ژیان‌و بوون‌و ئه‌و هه‌موو هێزو فه لسه‌فه‌و ئیعجابه بکه‌ن که له سیسته‌می ژیانی رۆژانه‌ی ئه‌و بوونه‌وه‌ره بچوکانه دایه که ساکارترین خه لقکراوی په‌روه‌ردیگارن به‌به‌راورد له‌گه‌ڵ توخمه‌کانی دیکه‌ی ژیان‌و گه‌ردوون. لێره‌دا پرسیاری سه‌ره‌کی‌و جه‌وهه‌ری ئه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر که سانێك گوایه راڤه کارو ره خنه گرن له دیارده دینیه‌کان، توانای ئه‌وه‌یان نه‌بێت لێکدانه‌وه بۆ ژیانی بوونه‌وه‌رێکی یه‌کجار ساده‌و بچوك بکه‌ن ئایا گاڵته به خۆیان ناکه‌ن کاتێ رێگه به خۆیان ده‌ده‌ن قسه له سه‌ر ئه‌و هێزو خولقێنه‌ره بکه‌ن که ئه‌و بوونه‌وه‌رانه‌و ژیان‌و گه‌ردوون‌و ئه‌وانیشی دروست کردوه‌و له پشت روح‌و مانه‌وه‌ی ئه‌وانه؟ ئه‌گه‌ر که سانێك مه عریفه که یان به‌شی ئه‌وه نه‌کات راڤه‌ی توخمێك، دیارده‌یه‌ك، بوونه وه‌رێك بکه‌ن که خودا درووستی

کردوون، ئایا دەتوانن بە تێگە یشتنی خۆیان قسە لە سەر قورئانی پیرۆزوگوتەکانی پەروەردیگار بکەن؟ لێرەوەشە دەبینین هەموو ئەو پرۆسە بە ناو رەخنە یانەی ئاین ئەوەندەی سۆزێکی رووتی بێ مە عریفە، هە لچوونی دەروونیو قسە وتن بە ئاینو هە ژمار کردنی هەرچی خەوشو ناشرینیەکانی ژیان لە سەر ئاین هەیە، لە پشتیەتی، نیو ئەوەندە رەخنەگان زانستی بوونو بابە تییبوونی تێدانیە. بەداخەوەش ئەو شێوازەی رەخنە گرتن لە ئاین هەلو مەرجێکی دژوارو زەمینەیەکی یە کجار ترسناکو مە ترسیدار دێنێتە ئاراوە لە کوردستان کە هەموو بوارێك بە هێزە ئاییلیە توندرۆکان بداتن هە رچی مە بە ستیان بێت بە ناوی ئاییئەوە ئەنجامی بدەن و پاساو بۆ کردەوەکانیان ببیننەوە. بۆیە بە بۆچوونی من دە بێ لە کاردانەوەی تێژە بە ناو رە خنە یەکانی ئەو رەوتە هوشیار بینو بە لایەنی کەمەوە بەنووسین یا بە دەربرین لەو دەر هاوێشتە ترسناکو دەرەنجامە مە ترسیدارانەیان ئاگادار بکەینەوە کە لێی دەکەونەوە دواجار بە زیان بە سەر کۆمە لگەو دە سە لاتیش تەواو دە بێت.

بێگومان ئاین بە یە کێك لە کایە هەرە گرنگە کانی هەر کۆمە لگایەك دادەنرێت، کە رۆلێکی گرنگو کاریگەرو بنەرەتی هەیە لە پێگە یاندنی سا یکۆلۆژیەتی مرۆڤو پرکردنەوەی بۆشایی روحی کە سەگانو هاوکات دیارترین ئەو تا یبەتمەندیە پەروەردەییو کۆمە لایەتیەشە کە دەکرێتە خە سلە تێکی دیکەی بوونی مرۆڤ لە پاڵ تایبە تمەندیەکانی تر. لە راستیدا هیچ کۆمە لگایەك نیەلە دنیادا بە بێ ئاین بژیت. جا ئاینێکی ئاسمانی یا زەمینی، بروادا یا بێ بروا. هیچ پێکهاتێکی ئە تنیکیو ئە تنۆگرافی نیە لە دنیادا ئاینێکی نەبێتو بروای پێ نە بێت. مرۆڤەکان بە بێ ئاین هەمیشە لە بۆشایەکی گەورەی روحی دەژینو بەردەوام لە گوماندان. گومان لە ژیانو بوونی خۆیان، لە هەموو گەردوونو لە هەموو شتێك. بە بێ ئاین هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت وەلامی پرسیارە فەلسەفیەکانی بوونو ژیانی دەست بکەوێت بە شێوەیەکی زانستیو بابەتی. بە شێکی زۆر

لەپێكهاتە ئەتنیكیە بچوكەكانو چەندین خێڵو هۆزی مرۆڤ لەدەرەنجامی ئەو بۆشایە روحیەی بەهۆی بێ ئایینیەوە گیرۆدەی بوونە پەنا وەبەر جۆرەها سروتی ئایینی دەبەنو بروای خۆیان لەوەدا دەبیننەوە. ئەگەر مرۆڤانێك هەبن( گا) بپەرستنو بە پیرۆزی ئاینی خۆیانی بزانن، كە لە راستیدا ئەو پەری دواكەوتوویی‌و بێ بروایە، ئایا كارێكی بێماناو نە زانانە نیە كە سانێك لایان وابیت ئاینی ئیسلام سەرچاوەی كوێرەوەریەكانەو ئاینێكی ئاسایەو دەكرێ مرۆڤ بە سادەیی وەریبگرێت ؟یان بە لایەنی كەمەوە هەوڵی كالكردنەوەی ئاینو لەقكردنی بروای بروادارەكان بەو ئاینە بدەن. ئەگەر كە سانێك هەبن ئاینی خۆیان لە توخمێكی سادەو نابابەتی‌و نامەعریفی‌و بێ هێزو ناوەرۆك ببیننەوە، ئایا گاڵتە جاری نیە كە سانێك لە ناتێگەیشتنیانەوە پێیان وابێت ئیسلامیش وەك هەر ئاینێكی تر ئاسایی وەردەگیرێتو دەشێ مرۆڤ بەلاوەكیەوە تە ماشای بكات. ئە گە ركە سانێك بێ ئەندازە پەیوەست بن بە ئاینی خۆیان كە هیچ هێزو سەرچاوەیەكی روحی‌و فیزیكی‌و غە یبی لە ئاینەكەیان دانیە بۆنموونە وەك ( بودیەكان) یا( تبیتی‌و كۆنفۆشۆسیەكان)، ئایا دەبێ ئێمەی مووسڵمان پێویست دەكات چەند پەیوەست بین بە ئاینەكەمان كە سەرچاوەیەكی هەرە دیاری مەعریفەو فیكری بە شەریەو كانگای زانستو داهێنانو لێكدانەوەی بوونو ژیانە؟ ئایا كۆمیدیا نیە كە سانێك بە خەیاڵ پلاوی خۆیان بانگەشەی ئەوە بكەن كە دەشێ ئیسلامیش هاوشێوەی ئەو ئاینانە بێتو هیچ رۆڵێكی لە بواری پەروەردەی كۆمەڵگە نەبێتو نە كرێتە سەرچاوەیەك بۆ رێساو یاساكانی ژیان؟

بێگومان ئاینی ئیسلام رۆڵێكی هەرە گرنگو كاریگەری لە بونیادی پەروەردەیی‌و سۆسیۆلۆژی كۆ مە ڵگای كوردی بینیوەوبە شێكی هەرە زۆری سیبمبولە دیارەكانی ئێمە لە رووی سیاسی‌و فەرهەنگیەوە پیاوی ئایینی بووینە. ئە گەر كورد وەك نەتەوەیەك هیچ بنەمایەكی رۆشنگەری هەبوو‌بێت لە مێژووی رابردوودا ئەوا بە دڵنیایەوە هەڵقولاوی نێو

نێوەندە ئاینیەکانو مزگەوتو حوجرەو خانە قاو تە کیەکانن. رووبەرێکی هەرە گەورە لە گوتاری ئەدەبی کوردی بەر ئەدەبیاتی شیعری کلاسیزمی دەکەوێتو سەرچاوەیەکی هەرە بە برشتی فیکریو مە عریفیە کە شاعیرە کلاسیکەکانی ئێمە بەرهەمیان هێناوە کە لە پاڵ شوناسی ئەدەبی هە لگری شوناسێکی ئایینی بوینە، شاعیرە کلاسیکەکانی ئێمە هەموویان پەروەردەی مزگەوتو تەکیەو خانەقاکان بووینە کەچی لە بواری داهێنانی ئەدەبیو فەرهەنگیەوە توانیویانە گوتارێك لە شیعر بونیاد بنێن، کە هەڵگری دنیابینیەکی فەلسەفیانەو رۆشنەگەرانەی وابێت، کە ئێستاش وێرای بوونی دەیان میتۆدی خوێنەوەی جۆراو جۆرلە بواری تێکستدا کەچی پانتایەکی هەرە گەورە لە بواری شیعری کلاسیکی کوردیدا بە پەنهانی ماوەتەوەو نە توانراوە پەی پێ ببردرێت. ئەمە لە سادەترین پێناسەدا قوڵی دنیابینی ئەو شاعیرانەوبوونی پاشخانێکی گەورەی مەعریفەی نووسینو خوێنەوە دەگەیەنێت، کە ئاشکرایە هەمووشیان پەروەردەی ئاینی ئیسلامو پیاوی نێو مزگەوتەکان بووینەو زۆربەی هەرە زۆریان (مەلا)و(سۆفی)و (حاجی) بووینە. ئەوانە لە سەردەمێکی یە کجار دوواکەوتوودا توانیویانە دنیایەك لە نووسین بەرهەم بهێنن کە هەندێکیان رەهەندێکی فەلسە فیانەی وایان هەیە، بۆ دیاردەکانی ژیانو بوونو عەدەم کە سەرسامی داماندەگرێت لەوەی کە چۆن لە سەردەمێکی دواکەوتوو لە رووی نووسینو نەبوونی هیچ قوتابخانەیەکی فێربوونو خوێندندا کە سانێك بتوانن ئە وهەموو مە عریفەیە بەرهەم بێنن بۆنموونە وەك ( مە حوی)ی شاعیر. ئەمە دەلالەتی ئەوەیە کە نێوەندە ئاینیەکانی ئێمە بە تایبەتیش (مزگەوت) هەمیشە سەرچاوەیەك بووینە بۆ رۆشنگەریو داهێنانو پەروەردەکردنی تاکی کوردی لە رووی فیکریەوە پێچەوانەی هەموو ئەو بۆچوونانەی لە بێ ئاگایانەوە وادەزانن ئاین سەرچاوەی دواکەوتنو نەزانینو کوێرەوەریو نە خوێندەواریە. وێرای ئەمەش پیاوە ئاینیەکانی ئێمە لە پاڵ رۆڵو پێگەی خۆیان، هاوکات ئاینیان هەمیشە کردۆتە رێبازێك بۆ تێکۆشانو خەباتی

نەتەوەیی و بەدەست هێنانی مافە نەتەوەیەکان. رابەرو سەرکردەو پێشەواکانی شۆرش و راپەرینەکانی کورد لە رابردوودا هەموویان (مەلا)و پیاوی ئایینی بووینەو هیچ کاتێکیش ئەمە نەبۆتە هۆی ئەوەی دابرانێك لە نێوان ئاین و پایە سیاسی و فە رهەنگیەکانی کۆمەلگای کوردی دروست ببێت. وەك ئەوەی ئاین رێگر بێت لە تێکۆشان و بە رجە ستە کردنی ما فە سیاسیەکان گە لی کورد یاخود سەرچاوەی ژێردەستەیی ئەو گە لە بێت. شۆرش و راپە رینەکانی کورد بە شێك بوونە لەو گوتارەی هەولی ئاوێتەکردنی خەباتی ئایینی و نەتەوەیان داوە لەیەك چوارچێوەدا. سیمبولە ئاینیەکانی ئێمە هیچ کاتێ هەولی ئەوەیان نەداوە ئاین و نەتەوە وەك دوو گوتارو پرسی فیکری گرنگ بەیەکتری نامۆ بکەن و خەباتی نیشتمانی و نەتەوایەتی بەئەرکی خۆیان نەزانن و ئاین دامالن لە کایەکانی دیکەی کۆمەلگا. بە پێچەوانەوە ئەوان لە پال ئاینیشەوە (کە مەبە ستمان لە دە ستەواژەی ئاین ئیسلامە) هەمیشە ئەرك و خەباتی نەتەوەیانەی خۆیان بەوپەری دلسۆزوشۆرشگێریەوە بە جێ گەیاندوە. ئیدی هەر هەولدانێك بۆ بە نامۆکردنی کورد بە ئیسلام و دابراندنی کوردو ئەو ئاینە لە ژێر ناوو گوتاری جیاوازو بە ئامانج و مە بەستی سیاسی یا ئایۆلۆژی بێت هەولێکی نە زۆکەو نەك هەر شوێن و جێگەی خۆی ناگرێت، بەلکو دەرهاوێشتەی یەکجار ترسناك و مەترسیدارو کوشندەی لێدەکەوێتەوە کە سەرەنجام کە شێك دێنێتە ئاراوە کە تیایدا کەسانێك بیانوو پاساو بدۆزنەوە لەوەی نەتەوەی کورد بە هەلگێراوە لە ئاین و دژبە ئیسلام پێناسە بکەن و لەوێوەش کار بۆ پراکتیزەکردنی تیۆرەکانی خۆیان بکەن. ئەو وێناکردنەی ئەمرۆ بۆ ئاین لە لایەن ئەو رەوتە رۆشنبیریەوە دەکرێت بە دیوێکی نێگە تیفدا، کە هەولی ئەوە دەدات هەرچی ناشرینی و خەوش و توندوتیژی و کێماسی کۆمە لگای کوردی هەیە بنالێنێتە ملی ئیسلام، هەرگیز وێناکردنێکی لۆژیکی و بابەتی نیەو هەزاران فەرسەخ دوورە لەو فەلسە فە یەی لە ئیسلام دایە. پێشاندانی ئاینی ئیسلام لە هەلومەرجی ئێستاماندا

لە کۆمەڵگای کوردی وەك نەودی سەرچاوەی هەموو نەهەماتیو دواکەوتنەکانی کۆمەڵگای کوردی بێت، تێزێکی یە کجار نادروستو هەڵەیەودەبێ هەموو ئەوانەی تەرحی تێزێکی لەو شێوە یە دەکەن دەبێ ئاکامە مە ترسیدارەکانیشی ببینن‌و ئەو بە رپرسیاریە تیانەش هەڵبگرن کە بە لایەنی کەمەوە لێی دەکەونەوە. جێگەی مەترسیو نیگەرانیە ئەمرۆ لە زەمینەی نووسین‌و رۆشنبیری کوردیدا بە ناوی رە خنە گرتن لە ئاین‌و هەوڵدان بۆ بە خۆر ئاواییکردنی کۆمە ڵگای کوردی( کە ئە میش تە نها لە سەر ئاستی رواڵەت نەك فیکر) رەوتێك سە رهەڵبدات کە مەبە ستیەتی ئاین‌و کۆمەڵگای کوردی بە یە کەوە نامۆ بکاتو بە هاودژی یە کتریان راڤە بکات. لەوە کارە ساتریش نەوەیە ئەو ردوتە رێگە بە خۆی بدات کە قسە لە سەر خوداو پیرۆزیەکانی قورئان بکاتو سەربوردەو حکایەتو لێکدانەوەی نازانستیو نامەنتقی بۆ ناوەرۆکی قورئانی پیرۆزبکاتو ژیانی پێغە مبەران بە شێوەیەکی دیکە ی جیالە قورئانی پیرۆزو خودا پیشان بدات. لە کاتێکدا ئەو رەوتە وەك باسمان کرد لە بە رامبەر لێکدانەوەی ژیانی (مێروولە)یەك دەستە پاچەو کۆلەوارە چ جای پە روە ردیگاری مەزن. ئەگەر بۆ یە ك چرکە ش خودا لێدانی دڵیان‌و بینایی چاوەکانیان لێ بسە نێتەوە ئەوا هەرچی سە رچاوەی مادیو بە ناو مە عریفی خۆیان هەیە بیبە خشن ناتوانن بیگێرنەوە. بە پێچەوانەوە ئا ینی ئیسلام هەمیشە دیارترین رووی پەروەردەیو کۆمە لایەتی کۆمە ڵگای کوردی بوە. ئاینێك بوە هەمیشە مۆراڵی کۆمە ڵگای کوردی راگرتوەوزەمینەیەك بوە بۆ پێگەیاندن‌و درۆستکردنی سایکۆلۆژیای مرۆڤی کوردوبە رجە ستە کردنی چەندان خەسڵەتی کۆمە لایەتیانەی جوان لە کۆمە ڵگای کوردیدا. ئەمرۆ بە ئاسانی هەست بە نەمانی ئەو خە سڵەتە جوانانە دەکەین کەدەرەنجامی هەوڵدانە بۆ پە راوێز خستنی ئاین‌و دوێنی کۆمە ڵگای کوردیان پێدە ناسرایەوە. ئە مرۆ کە مۆدێلێکی دیکەی ژیان لە رووی کۆمە لایە تیەوە لەنێو ئێمە بوونی هەیەو سەرچاوەی سەرهەڵدانی دەیان دیاردەی

کۆمەلآیەتی نادروستو تراژیدیو کوشندەن، دەردەجامی کزبوونی رۆڵی ئاینو ئەمیانی بە ها ئایینیو کۆمە لآیە تیە کانی کۆمە ڵگای کوردیە. کوا ئەو خە سڵە تانەی دوێنی لە مرۆڤی کورد هە بوون کە تەنانەت روحی ئەوەی تیابوو قوربانی بە خۆی بدات لە پێناو مرۆڤێکی تر؟ کوا ویژدان؟ کوا سۆزو بە زەیی؟ کو ا لێبوردەییو میهرەبانی؟کوا بە تەنگەوە هاتنو بە جێ گە یاندنی ئەرکە کۆمە لآیە تیەکان؟کوا رێزو هەوڵدان بۆ خۆشبە ختی کە سانو کۆمەڵگا؟ئەمرۆ لە سایەی ئەو مۆدێلە کۆمەلآیەتیە کۆپی کراوەی خۆرئاوا کە ئێمە پیادەی دەکەینو بۆتە شوێنکرەوەی مۆدێلی پێشووتر، ئێمە لە بەردەم مرۆڤێك داین کە گەردێك لە میهرەبانیو لێبوردەیی تیادانەماوەتەوەوهەستێکی شەرانگێزانەو تاکرەویانەی وای بۆدروست بوە کە تەنها بەرژەوەندیو نەرگسیەتی خۆی بەلاوە گرنگە وباکی بە هیچ بە هایەکی کۆمە لآیەتیو مۆرالی نیە. ئەمرۆ ئێمە لەبەردەم شێوە مرۆڤێك داین کە بچوکترین هەستی لێبوردەی نەماوەوتەنانەت ئامادەیە لە پەراوێزی دەمە قاڵێیەکی ئاسایی ژیانی رۆژانەدا بە دەیان کەس بکوژێت. ئەمرۆ مرۆڤێك دەبینین هەستێکی بەر بەریانەی وای بۆدروست بووە ئامادەیی ئەوەی تیایە دەست درێژی بکاتە سەر ئەندامانی خێزانەکەشی. کۆمەڵگای کوردی ئەمرۆ تەژیە لە جۆرەها تاوانی کۆمەلآیەتی تراژیدیانەی وا شۆك دەمانگرێت کاتێ گوێبیستی دەبین، کۆمەڵگای کوردی ئەمرۆ پرە لە سیماکانی رقو رق لێبونەوەو بە رادەیەك رووبەرێکی بچوك بۆ دیالۆگ نەماوەتەوە. ئەوە نیە رۆژانە گوێبیستی کارەساتو رووداوی وادە بین کە هەرگیز شایەنی ئەوەنین خوێنی ئاژەڵێکی لە پێناو برژێت، چ جای خوێنی مرۆڤ کە گەورەترین سەرمایەیە. کۆمە ڵگای کوردی ئەمرۆ تەژیە لەو جۆرە کەسانەی کە گەردێك سۆزو میهرەبانیو لێبوردەیان نیەوناژانن ویژدان چیەو بەهاکانی مرۆڤ لە چیدایە. وا دەژانن ژیان هەرتەنها لاساییکردنەوەیەکی کوێرانەو شوێنکەوتوانەی کۆمەڵگای خۆرئاوایە کە هەر یەکەو بۆ خۆیان دەژین. هەموو ئەو تایبەتمەندیە کۆمەلآیەتیانە کە ئیسلام

رۆلێکی سەرەکیو بنەرەتی دەبینێت لە دروست بوونیان، کزبوونو نەمانیان لە واقیعی ئەمرۆدا دەرەنجامی هەوڵدانە بۆ دابراندنی ئاین لە کۆمەڵگەو پەراوێزخستنی. چونکە ئیسلام زەمینەی دروست بوونو جێگیرکردنی ئەو بنەما پەروەردەییو کۆمە لایەتیانە دەرە خسێنێت. کۆمەڵگای کوردی ئەمرۆ لە قەیرانێکی گەورەی روحیو دەروونی دەژیت کەدەرەنجامی ئەو بە یەکدادانە نادروستەی شێوە ژیانی خۆرئاوایە لە گە لّ ئێمە بەبێ ئەوەی پێیەوە ئاشنا بین یا خود زەمینەمان بۆ رە خساندبێت. کێ هەیە لە ئێمە وێرای ئەو هەموو داهێنانو پێشکەوتنانەی ژیانی ئەمرۆ، بەلاّم خۆزگە بە ژیانی سادەو ساکارو جوانی دوێنێ نە خوازێت؟دوێنێ هیچ دەسکەوتو داهاتێکی مادی نەبوو، بەلاّم روحێکی جوانو تەژی لە سۆزوو لێبوردەی هەبوو. دوێنێ هە ژارانە دە ژیا وەلێ لە ویژدانو پەیوەندیە کۆمە لایەتیەکان دەولّەمەند بوو. هەموو ئەمانە دەرەنجامی نەمانو کزبوونی ئاینە، چونکە ئایینی ئیسلام هانمان دەدات لێبوردەو بە ویژدانو میهرەبانو بە سۆزوو بە زەیی بین. هیچ کاتێك ئیسلام هە لگری کلتوری توندوتیژیو دژبە پێشکەوتنەکانو جوانیەکانی ژیان نیە. بە پێچەوانەوە ئەوە کزبوونی هەستی ئایینیو پشتکردنە ئیسلامە لە واقیعی ئەمرۆماندا کە بۆتە هۆی ئەوەی مرۆڤێك دروست ببێت هێندە بەربەری بێت تەنانەت ئامادەیی ئەوەی تیایە دە ست درێژی سێکسی بکاتە سە ردایكو خوشکیشی!!!ئەوە ئیسلامە مۆرالّی کۆمەڵگای کوردی راگرتووە نەك گلۆبالیزمو مۆدێرنە!!!

*تێبینی/ئە م وتارە لە رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارەکانی (٨٢٤)و(٨٢٥) لە رۆژانی ١٧و٢٤/١/٢٠١١بلاوکراوەتەوە. . .

# مەرگ لە پێناو خۆشەویستیدا!

تائێستاش نازانم، سیحری ئەوە لە چیدایە کەمرۆڤ لە ژیانیدا بەرگەی گەورەترین کارەسات، قورسترین نەهامەتی، تراژیدیترین رووداو دەگرێت کەرووبەرووی دەبێتەوە، کەچی بەرگەی لەدەستدانی خۆشەویستەکەی ناگرێتو لە پێناویدا بەو پەری برواوە مەرگ هەڵدەبژێرێتو بە گوللەیەك یانیش پەتێك کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێت. نهێنی ئەوە چیە مرۆڤ لە ژیانیدا بەرگەی هەموو (نا)یەکان دەگرێت، کەچی بەتەنها ناتوانێ بەرگەی ئەو (نا)یە بگرێت کەلەدەمی خۆشەویستەکەی دێتە دەرەوەو کاتێ پێی دەڵێ ( نا تۆم خۆشناوێ یا ناتوانم ببورە). زۆرجار ئەو (نا)یە بە ئەندازەیەك ژیانی مرۆڤ دەگۆڕێت بەرەو شێتی یان گۆشەگیری یا خەڵوەتو دابڕانو دووره پەرێزی لە هەموو شتێك دەبیات. سەیرە مرۆڤ بگاتە رادەیەك لە دەستە مۆیی کەلەدوای خۆشەویستەکەی کەمە بەستمان رەگەزی بەرامبەرە( جا چ کچ یاخود کوربێت)، ژیان بە بێ مانایی ببینێتو لای وابێت لەگەڵ نەمانی ئەو ئیدی ژیانی ئەویش کۆتایی هات. لە کاتێکدا هەمووشمان تەواو دەبین کەچی ژیان هەر بەردەوامە.

هەمیشە بەبەردەوامی گوێبیستی ئەو چیرۆکە تراژیدیانە دەبین کەتیایدا گەنجەکانمان لە پێناو خۆشەویستەکەیاندا مەرگیان هەڵبژاردوەو هەریەکەیان لە بەر پاڵنەرێك بەڵام پەیوەست بە خۆشەویستی، خۆیان کوشتوە. لەو چیرۆکانەدا بەشێکی دابڕانو بەشێکی تری جیابونەوەو بە شێکی تری خۆشەویستی تاك لایەنە، کەکارەساتبارترین جۆری خۆشەویستیە، بەشێکی تریشیان لەبەر گوێ پێنەدانی کچەکە بە کورەکە، وێرای دەربڕینی هەموو جۆرە قوربانیەك بۆی، دەبینرێن، بەڵام هەموویان لەو خاڵەدا یەکدەگرنەوە کە ئەویش مەرگە لە پێناو خۆشەویستیدا. واتەی

گۆڕینەوەی پرۆسەی ژیانە بە مەرگ بەلاّم لە وکاتەدا کە خۆشەویستەکەی لەدەست دەدا.

رەنگ یە کێك لەو هۆکارانەی وابکات کە مرۆڤ بە ئاسانی لە شەری خۆشەویستی رەگەزی بەرامبەر بدۆڕێتو ئالاّی دیلیەتی بەرز بکاتەوە، پەیوەندی بەوەو هەبێت کە خۆشەویستی ئەوەندەی رایەلەکانی دەبە سترێنەوە بە سۆزو دڵ ئەوەندە پەیوەندی بە ئەقلاّنیەتەوە نییە. بەومانایەی ئەوەی لە دۆخی خۆشەویستیدا تەحەکوم بە مرۆڤ دەکات سۆزە نەك ئە قلّ. بۆیەشە دەبینین مرۆڤەکان کاتێ رووبەرووی پرۆسەی خۆشەویستی دەبنەوە ئەو شوناسە کۆمەلاّیەتیەیان نامێنێ کە پێی دەناسرێنەوە. بە لّکو دەبنە مرۆڤێکی سادەو ساکارودلّناسك و پڕ لە میهر کە بە بچوکترین شت دلّیان گەرد دەگرێتو ناتوانن ئازاری بچوکترین بوونەوەریش بدەن چونکە پڕ دەبن لە خاسیە تێك کە ئەویش تەنیا خۆشەویستیە. هەر ئەم سادەبوونەوەیەشە وادەکات کە ئەخوێنەوارێكو رۆشنبیرێك لە بەرامبەر چەمکی خۆشەویستیدا بە هەر هۆکارێکەوەبێت خۆیان بکوژن. چونکە لەوکاتانەدا بوارێك نامێنێتەوە کە جیاکاری بکاتە نێوان کە سێکی رۆشنبیرو نارۆشنبیر، بە لّکو ئەوەی لەو کاتەدا شوناس بە مرۆڤ دەدات و تەحەکومی پێدەکات ئەو هێزە رۆمانسیەیە کە هەموو ژیانی گرتۆتەوەو پێی دەوترێت خۆشەویستی.

بێگومان خۆشەویستی ئەو پەیوەندیە کۆمەلاّیە تی و سایکۆلۆژیەیە کە دەبێتە ئە لقەی بە ستنەوەی ئێمە لە رووی روحیەوە بە کەسی بەرامبەرمان. هەستێکی شاراوەیەو دلّو دەروونمان داگیر دەکات بە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەینو بزانین. زۆر جار کورێك بە تەنیا روانینێکی راگوزەری کچێك عاشق دەبێتو ئەو پەیوەندیەی بۆ دروست دەبێت. لە هەندێ کاتدا تا رادەیەکی بێ سنوور داگیری دەکاتو ئەگەر پرسیاریشی لێ بکەین کە بۆ وای لێهات لە وەلاّمدا دەلێ خۆشم نازانم بۆ؟دیارە ئەمە پەیوەندی بەو هەستە شاراوە هەیە کەباسمان کرد. رونتر بلّێین خۆشەویستی شەرێکی چاوەروانکراوەورووبەرووی مرۆڤ دەبێتەوە بە بێ ئەوەی بیریشی

لێکردبێتەوە. ئەم رووداوە گەورەو کاریگەرو هەژێنە کە پێی دەوترێت خۆشەویستی لە زۆربەی هەرە زۆری ژیانی مرۆڤەکان بە هەردوو رەگەزەوە روودەداتو گۆرانکاریەکی ریشەیی لە ژیانی ئەو کەسە دروست دەکات کە چیتر هەمان ئەو مرۆڤە پێناسە کراوەی پێشووتر نییە کە ئێمە دەماناسیت. ئەگەر عشقو خۆشەویستی نەبوایە نەشیخێك لە ئاینەکەی هەڵدەگەراوەو نەشاعیرێکیش دەبوە دێوانە. ئەرگە خۆشەویستی (ئەلیزا) نەبوایە هەرگیز (ئەراگۆن) ئەو شاعیرە ناسراوەی دنیا نە ئەبوو، بە لاَم لە سۆنگەی ئەوەی سەدان شیعری جوانو ناسکی بۆ ئە لیزا نووسی ئیدی لە پەراوێزی ئەو خۆشەویستیەو تا ئەزەل ناوی بەنەمری مایەوە لە دنیادا. لە راستیدا پانتایەکی هەرە گەورەی ئەدەبو هونەر گوزارشتن بۆ عەشقو خۆشەویستی رەگەزی مێو سەربوردەی ئەو چیرۆکانەمان بۆ دە گێرنەوە کە رویانداون چ لە کۆن بێت یاخود ئێستادا. تەنانەت لە زۆر کاتدا جوانترین تێکستی شیعری شاعیرێك ئەو شیعرانەن کە بۆ خۆشەویستەکەی نووسیویەتیو بونەتە بە شێك لە یادەوەری ئەو کەتەنها مەرگ دەتوانێ لە بیری بباتەوە. لەئەزموونی شیعری شاعیرانی ئێمەدا هەمیشە خۆشەویستی ئەو بنەما هونەریە بوە کە پانتایەکی گەورەی لە گوتاری شیعری گرتۆتەوە، بەو هۆیەشەو جوانترین وێنەی شیعری جوانیان هێناوەتە ئاراوەو تەنانەت هەندێکیان لە بەشێك لەشیعرەکانیان خۆشەویستیان لەپێشەوەی رەگەزەکانی دیکەی ژیانیش داناوەولایان وابوە بەبێ خۆشەویستی یار ژیانو سروشت هیچ ئیستاتیکایەکیان نییە، (گۆران) شاعیر لە دەربرینێکی شیعری جواندا وەسفی وێنەیەکی لە وشێوەیە دەکاتو دەڵێ:

**بەلاَم تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز**

**بێ رووناکیە بێ بزەی ئازیز**

بێگومان نموونەی شیعری دیکەی لەو شێوەیەشە زۆرە لە پانتای شیعری کوردیدا.

مرۆڤ کاتێ ڕووبەڕووی ئەزموونی خۆشەویستی دەبێتەوەوکە سێکی جیاواز لەرەگەزەکەی خۆی خۆش دەوێت،   بە ئەندازەیەك گۆڕانی بەسەردادێت کەهەموو بوونو ژیانی لەو کەسەدا دەبینێتەوە، بەلای ئەوە وە جوانیەکانی ژیان لەبەرئەوەیە کە کە سێکی خۆش دەوێت.  واتە کۆی دیاردەکانی ژیانی تایبەتی خۆی لەودا دەبینێتەوەو.  بە دەربڕینێکی تر دەتوانین بڵێین لەو کاتانەدا مرۆڤ لە هاوکێشەیەکی تردایەئەویش(دۆنادۆن) بوونە،  بەومانایەی توانەوەی روحی دێتە ئاراوە،  دیارە ئەمەش لەدەرەنجامی ئەو چونە نێو یەکتریەی پرۆسیسی خۆشەویستیە لە نێوان هەردووکارەکتەرەکە یانیش جار وایە کارەکتەرێك بەتەنیا.  واتە کاتێ خۆشەویستی وەك تەمێك پانتایی ژیانی ئەو مرۆڤە دەگرێتەوە،  ئیدی ئەو بەتەنیا ئەو خۆشەویستیە دەبینێتو  لایەنەکانی دیکەی ژیانی بە لاوە دەبنە بابەتێکی لاوەکی. چونکە دواجار ئەو لەدەرەنجامی ئەو  توانەوە دەروونیەی خۆی لەودا تەنها ئەو دەبینێت،  بێگومان ئەمەشە فاکتەری سەرەکی‌و شاراوەی مەرگی مرۆڤێك کە لەدوای لەدەستدانی خۆشەویستەکەی خۆی دەکوژێت.  چونکە ئەو ژیان بە هەموو ماناکانیەوە لە ڕووبەرێکی بچوك دەبینێت کە ئەویش کارەکتەری خۆشەویستەکەی خۆیەتی. لە دوو توێی ناوەرۆکی یەکێك لەو نامانەی کە لەدوای مەرگی کەسێك کەلە پێناو خۆشەویستەکەیدا مەرگی هەڵبژاردوەو خۆی کوشتوە، کەسەکە نووسیویەتی( ئەزیزم لە دوای تۆ ژیان بۆ من هیچ مانایەکی نییە. نەبە ختەوەردەبم‌و نەهیچ شتێکیش ئاسودەم دەکات بۆیە بەلای منەوە مەرگ خۆشترە لە ژیان. . . )

کاتێ هەڵوەستە لە ئاست ئەو چەند پەیڤانە دەکەین کە گوزارشتن بۆساتەکانی پێش مەرگی عاشقێك، دەزانین لە روانگەی کەسی عاشق و کارەکتەری مرۆڤی خۆشەویست ژیان ئەوە نییە کە بە هەموو ماناو ڕەهەندەکانیەوە کە هەیە.  بەڵکو ژیانی ئەو لە بوونی خۆشەویستەکەیدایە. بەدەربڕینێکی تر ئەو کۆی ژیان بچوكو  بەرجەستە دەکاتەوە لەکەسی

بەرامبەر کە ئەویش خۆشەویستەکەیەتی. هەرنەمەشە وای لێدەکات بەنەمانی ئەو ئیدی ئەویش دەست لە ژیانی خۆی هەڵبگرێتو مەرگ هەڵبژێرێت، هەرنەمەشە پاڵنەرە سایکۆلۆژیەکانی کەسێك کەلە پێناو خۆشەویستیدا کۆتایی بە ژیانی دێنێت. لە راستیدا هیچ شتێك بە قەد خۆشەویستی رەگەزی بەرامبەر ئیرادەی ژیان لە مرۆڤ ناسێنێتەوەو روحی هەپرون بە هەپرون ناکات. لە پرۆسەی عشقو خۆشەویستیدا بۆ هەردوو رەگەز مرۆڤ چیتر خاوەنی خودو شوناسی تایبەتیانەی خۆی نییە. بەڵکو تواوەتەوە لە شوناسێکی تر کە ئەویش خۆشەویستەکەیەتی. رەنگە لە روانگەی کەسانێکی تر مرۆڤێکی عاشق کە بەو ئەندازەیە دەستەمۆی خۆشەویستەکەی دەبێتو ژیان لە بوونی ئەودا دەبینێت، لۆژیکێکی هە لّە بێتو بە کردارێکی نائەقلانی راڤە بکرێت کە تیایدا چۆن دەبێ مرۆڤ بکەوێتە ژێر هەژموونی سۆزی کچێکەوە. بەلآم ئێمە ناتوانین گوزارشت لەو دۆخە سایکۆلۆژیەی عاشقێك بکەین ئەگەرۆ خۆمان بە هەمان ئەزموونندا رەتنەبین. ئەوسات ئێمە روانگەو تێگەیشتنێکی ترمان دەبێت بۆکەسەکە، بەومانایەی هیچ دوور نییە ئێمەش وەك ئەو بکەوینە ئەو دۆخە سایکۆلۆژیەوە کەئەو تیایەتی لە ساتی پراکتیزەکردنی چەمکی خۆشەویستی بۆ بەرامبەرەکەمان. بۆ مانایەی ژیان بچوك دەکەینەوە بۆ بوونی ئەو. هەر ئەم حالّەتە سایکۆلۆژیەشە وادەکات مرۆڤەکان لە پێناو خۆشەویستەکانیان مەرگ. هەڵبژێرن، چونکە بە تێگەیشتنی خۆیان بەنەمانی خۆشەویستەکەیان ژیانی ئەویش کۆتای دێت.

*لە ژمارە(٩٤)ی مانگی نیسانی ٢٠١١ی گۆڤاری (تواڵەی نوێ) بلآوکراوەتەوە. . . .

## راپەڕینو کاڵبوونەوەی ماناکان!

لەرۆژەکانی یەکەمی دەست پێکردنی شۆرشی ئۆکتۆبەری مەزن، کە تیایدا کۆتایی بەدەسەڵاتی ئەرستۆکراتیانەی بنە ماڵەیی قەیسەر هێناو گۆرانکاریەکی مەزن بوو لە ژیانی ئەو کۆمەڵگایە کە تائەو سات لەو پەڕی کوێرەوەریو نەهامەتی دەژیا. رۆژنامەنووسێك پرسیار لە (لینین)ی رابەری ئەو شۆرشەدەکاتو لێی دەپرسێت، (تاچەند گەشبینی بە بونیادنانی ولاّتێك کە لەو پەریِ دواکەوتوویيو کاولکاری دایەو ئومێدت چیەو دەتوانی چی بکەیت کە تۆ هاتیتە سەر زەمینەیەکی وێران؟) لینین لە وەلاّمدا بەرۆژنامەنووسەکە دەلیّ( ئێستا نا دوای دە ساڵی تر وەرەوە وەلاّمی ئەو پرسیارەت دەدەمەوە) گەرچی لینین تەنیا ماوەیەکی کورت دوای ئەو شۆرشە ژیاو نەیتوانی ئەوەی مەبەستیەتی هەمووی بهێنێتە دی بۆ گەلەکەی، وەلیّ رۆژنامەنووسەکە دوای دەساڵ کە چوەوە سۆڤیەت بینی بوژانەوەیەکی گەورە ئەو ولاّتەی گرتۆتەوەو کەم دێهات(نەك شار) ماون هێڵی شەمەندەفەرو کارەبایان بۆ نەچووبێتو هەموو زەویەکان دراونەتەوە چینی پرۆلیتارو کراونەتە کشتوکاڵ. ئیدی رۆژنامەنووسەکە سەرسام دەبێتو تیّ دەگات کە بۆچی لینین پێی وتوە دوای دەساڵی تر وەلاّمی ئەو پرسیارەت دەدەمەوەو دەزانیّ مەبەستی لینین لەوەدا (کردار)بوە نەك(دروشم). مەبەستی ئێمە لە باسکردنی ئەو رووداوە گێرانەوەیەکی مێژوویی نیە، بەقەد ئەوەی نیشاندانی نیازو خەونی رابەری شۆرشێکە بۆگۆرانکاریو نوێکردنەوەی کۆمەڵگەو تێکشکاندنی واقیعی ژیانی پێشووتر. ئەم رووداوە دەلیڤەیەکی چاکە تاکو لەوێوە بتوانین خوێنەوەیەکی رەخنەیی بۆراپەرینی بەهاری ساڵی نەوەدوویەکی کوردان بکەینو بەدیدێکی رەخنەیانەوە بپرسین تاچەند دروشمەکانی راپەرین بوونە کردارو تاچەند راپەرین توانی گۆرانکاریەکی

(ستراکتۆر)ی هەڵبەتە لە رووی سیاسی نا لە رووەکانی تر لە کۆمەڵگای کوردی بێنێتە ئاراوە. ئایا دوای بیست ساڵ لە و گۆرانکاریە تاچەند لە یادەوەری ئێمە ماوەتەوە لە ئێستادا بەرهەمی راپەرین چیە؟

بێگومان هەمووومان دەزانین بیست ساڵ لەمەو بەر لەدەرەنجامی زەبرو زەنگی رژێمی فاشی بەعس بەرامبەر گەلی کوردو بە سوود وەرگرتن لە ریێگە لاوازەی دەسەلاتی بەعس کە بە هۆی دۆرانیەوە لە شەری دووەمی کەنداو تێی کەوتبوو، بەپاڵپشتی هێزی جەماوەری کوردستانو ئامادەیەکی بچوکی هێزی پێشمەرگە، بلێسەی راپەرین هەڵگیرساو لەماوەیەکی کورتدا هەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستان (بە کەرکوك)یشەوە لەژێر چرنۆکی بەعس ئازادکران. ئەو رووداوە وەرچەرخانێکی دیرۆکی یەکجار گەورە بوو لە ژیانی کۆمەڵگای کوردی کە تانەو سات بە خۆیەوە نەیبینیبوو. راپەرین خۆزگەو ئومێدێك بوو کە سالانێکی درێژ بوو هەموو مان خەونمان پێوە دەدیت تاکو سەرەنجام ئەو خەونە بوو بە واقیع. لە سالانی سەرەتاو یەکەمی راپەریندا کۆمەڵگای کوردی ئومێدێکی گەورەی هەبوو بەوەی کە لە ژێر سایەی دەسەلاتێکی خۆماڵیانەی نوێ گۆرانکاری ریشەیی لەهەموو رووەکانەوە دێتە ئاراوەو راپەرین دەبێتە دەسپێکی ژیانێکی تازە کە تیایدا دادپەروەریو هاولاتیبوونو یەکسانیو دیمکراسیەتو دەیان چەمکی تر دەگرێتە خۆ. کە چی هەرزوو ئەو ئومێدەمان رما وەختێ بینیمان هەردوو حزبی دەسەلاتدار، لەسەر کێشەیەکی بچوكو بێ بەها شەرێکی نێوخۆی گەورەیان هەڵگیرساندوو هەزارەها رۆڵەی ئەو گەلەیان بەکوشتدا. تا ئێستاش خوێنی ئەو کەسانە بە لوتکەی چیاکانەوە دەتکێو ئاسەواری ئەو برینانە ماون. شەری ناوخۆ یەکەم کارەساتو رووداوی تراژیدی بوو دوای راپەرین کەبەداخەوە پەیوەندی نێوان تاکی کوردو راپەرینی پچراندوو ئەو بۆنە گەورەیەی بێ بەهاو کالکردەوە لە دنیابینی مرۆڤی کورد. ئیدی لەو ساتەوە تاکوئێستا هەوڵەکانی سرینەوەی پیرۆزیەکانی راپەرین درێژەیان هەیەو لە ئێستادا جگە لە یادەوەریەکی سادەو ساکارو ئاماژەیەکی

مێژوویی بچوك هیچ شتێکی تر ئێمه به ڕاپەڕین نابه ستێتەوه. شەڕی ناوخۆ کۆمەڵێك دەرهاوێشتەی کوشندەو ترسناکی لێکەوتەوه که بوونه هۆی ئەوەی نه توانرێت وەك پێویست کار بۆ دروشمه بنەڕەتیەکانی ڕاپەڕین بکرێتو بکرێن به واقیع. لەدوای ڕاپەڕینەوه بەماوەیەکی یەکجار کورت هەلومەرجێکی دژوارو سەخت بەهۆی سیاسەته چەوتەکانی هەردوو حزبی دەسەلاّ تدار هاته ئاراوه که تیایدا دووئیدارەییو ڕاوەدوونان له سەر بیرڕای سیاسیو ململانێی حزبی نادروستانەو بەحزبیکردنی کۆمەڵگای کوردی لێکەوتەوه. ئەو هەلومەرجه درێژەی کێشا تا سەرەنجام ئاشتەوای نێومالّی کورد هاته ئاراوەو به هۆی ڕوخانی ڕژێمی به عسەوه دۆخێکی سیاسیو کۆمەلایەتی دیکه دروست بوو که ئەمجارەیان له بری شەڕی ناوخۆ پەتایەکی یەکجار کوشندەو ترسناکتر بلاّوبۆوه که ئەویش گەندەڵییه. هەڵبەته ئەگەر زەمەنی ئەو بیست ساڵەی ڕاپەڕین بەراورد بکەین لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریه سیاسیو ئابوریو خزمەتگوزاریانەی له ئێستادا هەن، بەداخەوه نائومێدیەکی قول داماندەگرێت لەوەی کەڕاپەڕین وەك پێویست نەبۆته هۆی ئەوەی که کۆی ئومێدو خۆزگه کانی ئێمه بێنه دی. هەڵبەته ئەمه بەو مانایه نییه کەهیچ نەکرابێت، وەلیّ دەبیّ ئەوەش بزانین بیست ساڵ ماوەیەکی زەمەنی کورت نییه بۆ هەر دەسەڵاتو شۆڕشو ڕاپەڕینێك ئەگەر مەبەستی بێت گۆڕانکاری بێنێته ئاراوه. ئێمه کاتیّ کایەی سیاسی، پێشکەوتنی کۆمەلاّیەتی، دیمکراسیەتو کرانەوه، مافەکانی هاولاّتیبوون، خزمەتگوزاریەکانی ژیان، سەروەری یاساو ئازادیەکان له واقیعی ئەمڕۆماندا بەراورد دەکەین لەگەڵ ئەوەندە ساڵەی دوای ڕاپەڕین دەبینین ئاستەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگا زۆر لەدواوەی ئەو زەمەنه درێژەی ڕاپەڕینن. ئەوەی بوونیشی هەیه تەنیا شوێنکەوتنو لاساییکردنەوەیەکی کوێرانەی دیوی دەرەوەی خۆرئاوایه. دەنا لەئاستی ناوخۆدا کۆمەڵگای کوردی هەمان ئەو کۆمەڵگا نەریتگەرایەیه که پێشووتر هەبوه. کوا داهێنانه زانستیو ئەدەبیو ژیاریەکانی کۆمەڵگای کوردی له دوای

راپەرین؟کوادیمکراسیەت‌و مافەکانی مرۆڤو دادپەروەری کە هەموومان نومێدمان وابوو راپەرین بۆمان دەستبەر دەکات. بەرهەمە راپەرین لە ئێستادا کۆمەلّی دیاردەی ناشرینی ترە کە تادێت سیماکانی نیشتمان‌و دەسەلاّت‌و پیرۆزیەکانی راپەرین بێ بەهاو نرخ دەکات لە دنیابینی تاکەکان.

دوای بیست سالّ لە راپەریندا کەچی لە ئێستادا ئێمە شێوە ژیانێکی کۆمەلاّیەتی وا ئەژین کە تیایدا هەژاری سیمایەکی هەرە دیاری ئەو کۆمەلّگایەیەو نادادپەروەری‌و نایەکسانی بە ئەندازەیەکە کە کەسانێك (فیرعەون) ئاسا دەژین‌و ملیۆنانی تریش لە ژیانێکی سەخت‌و ئەو پەری هەژاری دەژین. راپەرین بۆ نوخبەیەکی کەم بوە دەسکەوتێك بۆ دەرکەوتنی توێژێکی بیرۆکراس کە هەموو سامانی ئەم نەتەوەیە بخەنە خزمەتی خۆیان لەکاتێکدا رووبەرێکی هەرە گەورەو بەرفراوانی کۆمەلّگای کوردی هەژارن‌و ناتوانن پێداویستیە سەرەتایەکانی ژیانیان دابین بکەن. تائێستاش خێزانی واهەیە لە نێودوکان‌و سەرگۆرستانەکان دەژیت‌و بستێك زەوی شك نابات لانەیەکی تیادا دروست بکات. لە بەرامبەر ئەمەشدا دەسەلاّت شوقەو ئو تومبێلی دوا مۆدێل بۆ ئەندام پەرلەمانەکانی دەکرێت‌و بە گوژمەیەکی خەیالیّ‌و سالاّنە لە شکرێك بەرپرس خانەنشین دەکات. لە راستیدا قولکردنەوەی جیاوازی چینایەتی‌و سەرهەلّدانی دیاردەی نادادپەروەری‌و پۆلین کردنی مرۆڤەکان بۆ پلەکانی هەژارو خواپێداو، دابرانی گەورە لە ئاستی ژیانی تاکەکان بەرهەمی راپەرین بوون بۆخودی ئەو شەقامە جەماوەریەی کە داینەمۆی سەرەکی راپەرین بوو. بەرهەمی راپەرین هێنانەدی دەسەلاّتێکی دیموکراسی‌و کراوە نەبوو، بەلّکو هێنانە ئارای شێوازێکی دەسەلاّت بوو کە تاسەر ئێسقان حزب‌و حکومەت تێکەلّکراوە بەرادەیەك مافەکانی هاولاّتیبوون بە ستراونەتەوە بە سنووری حزبی بوون. لە کوردستاندا ئەوە هاولاّتی نیە شوناس بە حزب دەدات بە لّکو ئەوە حزبە شوناس بە هاولاّتی دەدات‌و بریاردەدات. ئەمرۆ بە بێ گەرانەوە بۆحزب

ناتوانین بچوکترین ئەو مافانەی خۆمان بەر جەستە بکەین کە پێویست دەکات هەموو هاولاتیەك هەیبێت. ئەمرۆ دەبینین دامەزراندن بە شێوەیەکە کەلە یەك خێزاندا حزب ئامادەیە چەندین کەس دابمەزرێنێت، وەلێ بە شێکی هەرە زۆری خێزانی کوردی هیچ سەرچاوەیەکی داهاتیان نییەولە ژیانێکی سە خت دەژین. ئەمرۆ دوای زەمەنێکی درێژ لە راپەرین کەچی سیستەمی کارگێری ئێمە سیستەمێکی ئەو پەری ئاتەکنۆکراتو پیشەیەو تاکە پێوەری پێدانی هەر پۆستێکی کارگێری لە سەر بنەمای حزبی بوونو وەلانە بۆحزب، مامۆستایەك لە سۆنگەی ئەوە ناکرێتە بەرێوەبەری پەروەردە کە کەسێکی لێهاتوو کارامەو بە خزمەتو قاڵبووی نێو بواری پەروەردەیە، بەڵکو لە سۆنگەی ئەوە دەکرێتە بەرێوەبەر کە کادیرێکی حزبیە، ئەوسا گرنگ نیە کە ئاخۆ شایستەیی خۆی بۆ ئەو بەرپرسیاریەتیە تاچ رادەیەکە. وەرگرتنی هەر بەر پوسیاریەتیەك لە هەر فەرمانگەیەکدا پێوەرەکانی دڵسۆزی بوونو پرۆفیشنالی بوون نیە، بەڵکو ئنتمایەتی بۆ حزب، بۆیەشە دەبینین بەرهەمی ئەو شێوازە لە دەسەلات دروست بوونی گەندەلیو ناشارەزاییو رۆتینە لە فەرمانگەکانی ئێمە، بەرادەیەك کە دەتوانین بڵێین هەرچی پێوەرێکی زانستیو لۆژیکیە لە هیچ روێکی خزمەتگوزاریو کارگێری نابینرێت. بە شێکی هەرەگەورەی ئەو پرۆژە خزمەتگوزاریانەی ئەنجام دەدرێن جگە لەوەی گورمەیەکی خەیالی زۆریان بۆ تەرخان دەکرێت، هاوکات لەرووی کاتو ماوەی جێبەجێکردنیش ماوەیەکی زۆر دەخایەننو سەرەنجامیش بە سەقەتیو بێ پلانی تەواو دەبن. وێرای ئەوەی لە ئەنجامدانیشیان چەندین جیاوازیو نادادپەروەریو نایەکسانی دەبینین، بۆنموونە بەسەدان پرۆژە لە یەك کاتدا بۆشارێك دەردەچن، کەچی دەیان شاری تر بێ پرۆژەن. لە چوارچێوەی یەکەی کارگێریدا دوو شار وەك یەکتری قەزان بە لام جیاوازیەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە کەچی هەردووکیشیان هەر قەزان. پرۆژە خزمەتگوزاریەکان لەسەربنەمای رادەی پێویستبوونو جوانکردنی سیماکانی شارو کەمکردنەوە

لە گرفتی هاولاَتیان ئەنجام نادرێن، بەڵکو لە سەر بنەمای دەرکردنی بریار لە سەرەوە بریاریان لێدەدرێت بە بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی خەڵکەکە چەند پێویستی بەو پرۆژەیە. بەدەربرینێکی تر لە شارێکدا قوتابخانە نییە، نەخۆشخانە نییە کەچی حکومەت هەڵدە ستێت یاریگایان بۆ دروست دەکات. نە خۆشخانەیەك دروست دەکرێت بە دەساڵ تەواو نابێتو سەدان ملیۆن دۆلاریشی تێدەچێت لەکاتێکدا هەموو ولاَتانی ئەورووپا بەیەکەو دەبە سترێنەوە بە کەمتر لەو ماوەیە. گەرە لاوژێو بێ بەرنامەی لەو شێوەیە لە کوێی دنیا هەیە مە گەر لەکوردستان؟ ئەم نموونانەو سەدان نموونەی تری لەو شێوەیە نیشانی دەدەن کە بە رهەمی ڕاپەرین لە ئاستی کارگێریدا دروست بوونی سیستەمێکی کارگێریو تەکنۆکراتیو زانستی نەبوە بە قەد ئەوەی ڕەچاوکردنی پێوەرەکانی حزبیبوونو کارکردن بوە بە هاوکێشەی (کە سی نەشیاو بۆ شوێنی شیاو) لە کاتێکدا دوای بیست ساڵ لە مێژووی ڕاپەرین دەبوایە ئێستا لە کوردستان نموونەیەکی هەرە جوانو بەرزی سیستەمی کارگێری لە ئاستی خزمەتگوزاریو پرۆژەکانو لایەنی بیناسازیو جوانکاری هەبوایە کەچی سەیرە حکومەت بایەخ بە سەنتەرو بازاری شارەکان دەدات کەچی گەرەکە هەژار نشینەکانیش فەرامۆش دەکات. جێگەی داخە دوای بیست ساڵ لە ڕاپەرین کەچی ژێرخانی ئابوری کوردستان لە ڕووی پیشەسازیو کشتوکاڵو بازرگانی وێرانەوئابوری کوردستان ئابوریەکی هاوردەیەو سەرجەم ئەو کەلوپەلو پێداویستیانەی ژیان بە شێوەیەکی لاوەکی بێت یانیش بنەرەتی لە دەرەوە دەهێنرێنو کۆی ژێرخانی ئابوری کوردستان وابەستەیە بەو بوجەیەی لە بەغداوە دێتو ئەگەر ئەو شادەمارە ئابوریە نەمێنێت، بەدوورنازانرێت هەموو کۆمەڵگای کوردی لە برسان بمرێت. کەواتە دەکرێت بپرسین کوا بەرهەمی ڕاپەرین لە بواری ئابوریو بونیادنانەوی ژێرخانی کوردستانو گۆرینی کۆمەڵگای کوردی لە هێزێکی مرۆیی بە کاربەرەوە بۆ هێزێکی بەرهەم هێن؟ کامانەن ئەو کارگە گەورەو بەرهەم هێنەرانەی کە بشێت ببنە سەرچاوەی داهاتی ئابوری

کوردستان‌و هێزی دەستی تیا بە کار ببرێت‌و کۆمەڵگای کوردی پێویست نەکات پشت بە دەرەوە ببەستێت؟ بە داخەوە کاتی سەرنج لە ئابوری کوردستان دەدەین دوای بیست ساڵ لە راپەرین بە ئاسانی هەست دەکەین کە ئابوریەکی وێرانەو ئێمە ناچارین لە هەموو شتێك پشت بە دەرەوە ببەستین. لە کاتێکدا دەبوایە تا ئێستا بە دەیان کارگەی بەرهەمهێنی گەورە لە کوردستان هەبوایە کە گەلو پەلیان هاوردەی دەرەوەش بگردایە چونکە بیست ساڵ زەمەنێکی کورت نییەو دەتوانرێت پرۆژەو بە رنامەی ستراتیژی گەورەی تیادا ئەنجام بدرێت، بەرهەمی راپەرین لە بری ئەوەی ئاوەدانکردنەوەی دێهاتەکان‌و زیندوکردنەوەی ژێرخانیان بێت، کەچی بە پێچەوانەوە دێهاتەکان چۆڵ دەکرێن‌و حکومەت سە رجەمیان دەکات فەرمانبەرو موچەیان دەداتێ‌و کۆچی پێچەوانە دەبینین. دوای بیست ساڵ لە راپەرین کە چی تاکو ئێستاش کایەی پەروەردەیی ئێمە بە دەست چەندین گرفتی گەورە گیری خواردوەو تاکو ئێستاش بالأخانەکانی خوێندن بە ژمارە یە کجار کەمن‌و ئەوانەشی کە هەن لە سەدان رووەوە کەمو کورتیان هەیەو هەرگیز بۆ سیستەمێکی نوێی خوێندن لە بار نین. قوتابخانەکانی ئێمە هەموویان ئە ژین لە ژمارەی زۆری قوتابیان‌و بە رادەیەك کە هەندێکیان زیاد لە دەوامێکیان تیادا دەکرێت لە کاتێکدا دوای بیست ساڵ لە راپەرین دەبوایە ئێمە خاوەنی سیستەمێکی پەروەردەیی وا بواینە کە نموونەیی بوایە لە ئاستی سیستەمی ولأتانی دەوروبەر. بەو مانایەی هەموو پێداویستیە پەروەردەیەکانمان دەستبەربکرایە، بەلأم کاتێ لە ئاستی پراکتیکیدا دەروانینە پرۆسەی خوێندن بە ئاسانی هەست بە بوونی سەدان کەموکورتی دەکەین کە دەشێ لە وتارێکی تردا بە درێژی بێینەوە سەری. دوای بیست ساڵ لە زەمەنی راپە رین کە چی تاکو ئێستاش گرفتی بوونی کارەبایەکی بە ردەوامان هەیە کە سادەترین‌و ساکارترین پێداویستی ژیانی مرۆڤە، ئاخۆ ئەنگی نییە بۆ دەسە لأتێك بە بیست ساڵ نەتوانێیت گرفتێکی خزمە تگوزاری چارەسە ربکات؟ لە کاتێکدا ئە گە ر پلان هە بێت‌و بە درێژایی

نه وچەندین ساڵە قۆ ناغ بە قۆناغ هە و لی چارە سەر کردنی بدرابایە بێگومان تاکو ئێستا چارسەر دەکرا. سە یرم پیێ دێت دوای بیست ساڵ لە راپەرینو بونیادنانی دەسە لاتێکی خۆماڵی کە چی تاکو ئێستاش چەندین گەرەكو شوێنو تەنانەت شاریش گرفتی دابینکردنی ئاوی خواردنەوەیان هەیە بە شێوەیەکی گولهاوو رێك، ئەمە وێرای نەبوونی زێرابو گونجاوی شە قامەکانو پارکو قوتابخانەو نەخۆشخانەوباخچەی ساوایانو . . . . تد. هەر بۆنمونە لەو شارەی منی لیێ دەژیم بە درێژایی ئەو بیست ساڵەی راپەرین تاکە یە ك نە خۆشخانەش دروست نەکراوەو هەمان نە خۆشخانەی پێشوە ئەمە لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە لە ئێستادا پێنج بە رابەری ئەو کاتە. ئاخۆ ئەمە لە کارەسات بەو لاوە هیچ مانایەکی تر دەگە یە نێت؟ دوای بیست ساڵ لە راپەرین کە چی تاکە یەك پارکیش لە وشارەی منی تێدا نە ژیم دروست نەکراوە. بێگومان ئەمانە مشتێکن لە خەروارێكو نمونە یەکی بچوکی گویێ نەدانو پشت گویێ خستنی بەها پیرۆزەکانی راپە رینە کە هەموومان ئومێدمان وابوو فریادرە سێکەوەبە هە شتێکی نمونەییمان بۆ بونیاد دەنێت. بەداخەوە کێشەکە پەیوەست نییە بەوەی کە بودجە نییە، بە قەد ئەوەی پە یوەندی بە گەندەڵیو قۆستنەوەی سە رمایەی گشتیو بەرجەستەکردنیەتی بۆ تەنیا توێژێکی پیرۆزکراس. ئەگینا بودجەی کوردستان بە بەراورد لە گەڵ لایەنی دیمو گرافی کوردستان بو دجە یەکی زۆرەو ئە گەر پلانو بە رنامە یەکی گونجاو هەبێتو دادپەروەرانە بەرێتە گەر بێگومان بوژانەوەو ئاوەدانیەکی زۆر رووماننتێدەکات. سەیرە لەوە دایە لە کوردستاندا نەوتو گازی سرو شتیش بەرهەم دەهێنرێت، کەچی کیێ لە ئێمە هەستی بە بچوکترین گۆڕانکاری ژیان کردوە لە دەرەنجامی ئەو چوونە دەرەوەی نەوت؟ لە کاتێکدا بە رهەم هێنانی نەوت لە هەر شو ێنێکدا سەرەتای دەست پێکردنی خۆ شگوزەرانیەکانو مایەی ئاسودەییو پێشکەوتنی ژیانی کە سانی ئەو شوێنەیە. بە داخەوە کاتیێ ئاستی خزمەتگوزاریو بوژانەوەی ژێرخانی کوردستان بەراورد دەکەین

لەگەڵ ئەو بیست ساڵەی راپەرین هەست دەکەین زۆرمان ماوەو دەبوایە یە کجار لەوە زیاتر کرابوایە ئاخر کارەساتەو تراژیدیایەکی گەورەیە لە هە رێمێکدا نەوتو گاز بە رهەم بهێنرێتو بودجەیەکی زەبە لاحی هە بێتو لە هی دەیان ولآت زیاتر بێت کە چی هاوولآتی وای تیادا بژیت لە بەر هەژاریو بە مەبەستی دابینکردنی ژیانی منداڵەکانی ئامادە بێت ( گورچیلە) کانی بفرۆشێیت، ئایا راپەرین هیچ ماناو بە هایەکی ماوەو خەونێکی نەزۆك نەبوو؟؟؟

تێبینی / ئەم وتارە لە رۆژنامەی ( رێگای کوردستان) ژمارە(٩٢٦) رۆژی ٢٠١١/٣/١٦بلآوکراوەتەوە. . . .

## بێ بەهاکردنی (ئافرەت) لە گۆرانی کوردیدا!

بێگومان رووبەرێکی بەرفراوان لە ئەدەبیاتو هونەری مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی، تەرخانە بۆ وەسفو پیاهەڵدانو دەرخستنی جوانیەکانی ئافرەت وەك یەکێ لەپایەتەکانی ژیان. لەپەراوێزی ئەمەشدا چەندان تێکست لە شێوەی نووسراوگوتراو دەبینرێت کە تیایدا رەنگدانەوەی ئافرەت لە نێوپاندا هەستی پێدەکرێت. بە درێژایی مێژووی هونەری گۆرانی کوردیش ئێمە هەست بە ئامادەیی ئەو رەگەزە دەکەین چ لە چوارچێوەی هونەری میللیو فۆلکلۆری بێت وەك سەربوردەو بەستەو حەیران، یاخود ئەو هونەرە مۆدێرنەی ئێستا دەبینرێت. بەلاّم کاتێ بەوردی گوێبیستی هونەری گۆرانی کوردی ئەبینو هەڵوەستە لە ئاستی ئەو رەنگدانەوەیە دەکەین کە ئافرە تی لەو هونەرە هەیەتیو زمانی ئەو وەسفکردنو وێناکردنەی ئافرەت دەخەینە بەر شرۆڤەو راڤەکردن، دەبینین ئەوەندەی وەسفی جەستەو پێکهاتی بایۆلۆژی ئافرەت دەکرێت، ئەوەندە هێما بۆلێهاتووی ئافرەتو ناسنامەی بوونی ناکرێت. بە دەربرینێکی تر بە دەگمەن لە گۆرانیەکی کوردیدا ئێمە گوێبیستی ئەوە دەبین کە وەسفی توانا هزریو لایەنە پەروەردەیەکانو ئاستی یەکسانی لەگەل پیاو بکرێت. کەچی بە پێچەوانەوە هەمیشە لە بەرامبەر ئەمەدا وەسفی سنگو بەرۆكو سوخمەوچاووروومەتو برۆو قژوناولەدو. . . . . تد دەکرێت. بەومانایەی هەموئەو وەسفانە لە خزمەت جوان نیشاندانی لایەنی جەستەیی ئافرەت بوە کە ئەمیش بە بۆچوونی من جگە لە گوتارێك بۆ هەراجکردنی ئافرەت هیچ مانایەکی تر ناگەیەنێت. دیارە ئەمەش بەمەبەستی ورو ژاندنو سەرنج راکێشانو دروستکردنی هەستی سەرسامیە بۆ پیاو لە هەمبەر ئافرەتدا کە

کۆتایەکەشی بە تێرکردنی غەریزە یەك دێت. کاتێ لە هەندێ برگەو نێوەرۆکی تێکستی ئەو گۆرانیانەش ورد دەبینەوە ئەو راستیەمان بەر چاو دەکەوێت. نەك هەر ئەمە تەنانەت لە هەندێ گۆرانی کوردیدا ئافرەت وەك بونەوەرێکی لاوازودەستەمۆوکۆیلەو فرۆشیارو خزمەتکاری پیاو وێنا دەکرێتو ناسنامەکەی ئەوەندە بچوك لە ئاست پیاودا پیشان دەدرێت ئێمە واهەست دەکەین کە ئەمە رەگەزە جوانەکەی دیکەی ژیان نییە بە قەد ئەوەی خزمەتکارێکی پیاوەو ئامانج لە هەبوونیدا تەنیا تێرکردنی غەریزەکانی ئەوەو چیتر نا. ئەو تێروانینە هزریەی لە ئاستی کۆمەلآیەتیدا کۆمەلگای کوردی بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئافرەت هەیەتی لەزۆر کاتدا بە هەمان رەهەندو تێروانینەوە بەرجەستە دەکرێتەوە لە گوتاری ئەدەبیاتو هونەری کوردیدا.هەر ئەمەشە وادەکات کە لە زۆر کاتدا تێکستی نووسراوی ئێمە لە ئاستی هونەریدا هەلگری هەمان ئەو زمانە سادەو ئاماژە ترسناکانە بێت کە پیاو بۆ ئافرەت لە چوارچێوەی فۆرمی کۆمەلآیەتیانەی ژیان هەیەتی. بێگومان هەلّەیە ئەگەر پێمان وابێت ئەو شێوە گوزارشتکردنە هەر تەنها چوارچێوەیەکی زمانەوانی رووتی هەیەو هەر تەنیا بەمەبەستی نیشاندانو بەرجەستەکردنێکی ئاسایانەیەو بە شێکە لە ئستاتیکای زمان بەدەر لە دیوە بابەتیەکە. چونکە ئەو شێوە تێروانینە بەرجەستە کراوی نێو دەقێکەو بێگومان دەقیش رەنگدانەوەی هزری نووسەر خۆیەتی. بوونی دیدگایەکی کۆمەلآیەتی لەو شێوەیەش درێژکراوەی ئەو ئەقلّیەتەپە ترپاکییە کە رۆژهەلآتی ناوەراست بە گشتیو کۆمەلگای کوردیش بە تایەتی بۆ ئافرەت هەیەتی. کە هەمیشە وەك ئامێرێك کە لە خزمەت پیاو دایە دەروانە ئافرەت.

لە راستیدا هونەری گۆرانی کوردی بە شێوەیەکی گشتی لە رابردوو تارادەیەك لە ئێستاشدا، ئەوەندەی هە لگری پە یامێکی سۆزدارییە ئەوەندە پە یامێکی هیۆمانستی نییە. بەو مانایەی ئەوەندەی کار لەسەر لایەنە وروژێنەرەکانی ئافرەت دەکرێت ئەوەندە ئاماژە بۆ تواناو لێهاتوویی و

بوونی مرۆڤانەی ئافرەت ناکرێت لە ژیاندا. کاتیٚ سەرنجیش لە رووبەرێکی بەرفراوان لە گوتاری هونەری گۆرانی کوردی دەدەین‌و ناوەرۆك‌و پەیامی ئەو گوتاری شیدەکەینەوە بە ئاسانی درك بەو راستیە دەکەین‌و هەمیشە ئەو وەسفانە دەبینین کە تیایدا وێنای جەستەو لایەنی بایۆلۆژی ئافرەت دەکرێن. بە دەربرینێکی تر ئێمە گوتارێك دەبینین کە هەموو مەبەست‌و ئامانج تیایدا دروستکردنی سایکۆلۆژیە تێکی هەستەوەری‌و سەرنج راکێشانە بۆپیاو لە هەمبەر ئافرەتدا. لە بەشێك لە گۆرانی کوردیدا بە رجەستە کردن‌و وێنا کردنی ئافرەت بەر مەبنای ئەوە نییە کە مرۆڤەو سیمایەکی جوانی هەیەو هاوبە شێکی دیکەی ژیانی ئێمەیە کە بەبیٚ بوونی بۆشایەکی گەورە دروست دەبێت لە ژیانمان، بەڵکو لەو سۆنگەیەیە کە جوانیەکەی‌و ئەرمونیانی‌و لەش‌و لاریەکەی بۆ پیاوەو لە خزمەت ئەو دایە. تەنانەت لە هەندیٚ کاتدا دەربرینەکان لەوە توندتریش دەبن‌و کاتیٚ گوێبیستیان دەبین شەرم داماندەگرێت لەوەی هونەرێکمان هەبێت بەو شێوە بچوك‌و بیٚ نرخیە بروانێتە ئافرەت‌و وەك کالآیەك بۆ پیاو سەوداو مامەڵەی پێبکرێت. لەو دەربرینانەدا ئافرەت وەك مرۆڤێکی بیٚ ئیرادەو خزمەتکار دێتە بەرچاو. مایەی نیگەرانیە لە بە شێکی زۆر لە پانتایی گۆرانی کوردیدا هەوڵدراوەو دەدرێت ئافرەت وەك بوونەوەرێکی بێدەنگ‌و لاوازوخۆی بنوێنێت‌و هەرکات‌و ساتێك پیاو مەبەستی بوو بۆ خزمەتە تەکانی خۆی بە کاری بێنیٚ، لە هەندیٚ کاتدا ئەو دیدگا کۆمەلآیەتیەو شێوە روانینە بۆ ئافرەت، بە بیٚ هیچ شەرم‌و سلکردنەوەیەکی هونەریانە خۆی بەرجەستەدەکات‌و دەنوێنێت بەئەندازەیەکی زەق‌و دیارو بەرچاو کە هیچ رامانێکی ناوێت. بگرە لە هەندیٚ گۆرانی کوردیدا بە زمانێکی کۆمەلآیەتیانەی رووت‌و بیٚ بەها ئەو دیمەنانە نیشان دەدرێن‌و بەرجەستە دەکرێن. بێگومان ئەگەر برگەو ناوەرۆکی گۆرانی کوردیش وەك سامپلێك لەم رووەوە شیبکەینەوە بە ئاسانی هەست بەو گوزارشتە هونەریانە دەکەین. بۆنموونە لە گۆرانی کوردیدا ئەو دەستەواژانە دەبینرێن( دەگرم شەمامە تۆ

دەنگیّ مەکە)( بگرە ئەو دەستەی کە بە سینەت فیّرە)( باوکت رازیکە دایکت بۆمن هیچ نالیّ)( دایکیّ ببینە کیژیّ بخوازە)( گوتم چای ناخۆم گەردەنیّ هیّوە بینە)( ماچو دینار بستیّنە/ وەك ئەوەی ئافرەت دوکاندار بیّت)(هەرمیّ کانت بۆمن بیّ). . . . . ستد کاتیّ لەو دەربرینانە ورد دەبینەوە کە مشتیّکن لە خواریّك‌و بەشیّکی بچوکن لە پانتایەکی هەرەگەورەو بەرفراوانی گوزارشتکردن لە ناسنامەی ئافرەت لە گۆرانی کوردیدا، ئیدی درك بەو ئەقلیەتە پەترپاکیەی پیاوی کورد بەرامبەر بە ئافرەت دەکەین کەهەمیشە لەروانگەی ئەودا پلەیەکی تری نزمتر لە خۆی هەیە. هەلّبەتە کاتیّ مرۆڤیش بەو پیّوەرە روانیە رەگەزی بەرامبەری ئیدی بەلایەوە ئاسایی دەبیّت چۆن‌و کەی مەبەستی بوو بەو شیّوەیە پیّناسەی بکات. دەنا لەو دەربرینانەدا ئیّمە سادەترین پەیام‌و بچوکترین بە های سایکۆلۆژی‌و هزری مرۆڤ نابینین کە درابیّتە پالّ ئافرەت لە گۆرانی کوردیدا. بەوەی کە ئەویش وەك ئیّمە مافی هەیەو ئازادە لەوەی چۆن ویّنای ژیانی خۆی دەکات‌و پاشکۆی ئیّمە نییە. نەك هەر ئەمە تەنانەت پاساوی بیّ ئە قلّی‌و ساویلکەییشی دەخریّتە پالّ. بۆ نموونە ( باوکت رازی کە دایکت بۆمن هیچ نالیّ). لیّرەدا دەکریّ بپرسین بۆ دەبیّ دایك ئەوەندە ساویلکەو دەستەمۆبیّت کە هیچ کیّشەیەکی نەبیّت لەوەی کچەکەی ببیّتە مولّکی پیاویّك‌و کیّشەکە تەنیا باوکی بیّت؟ هەر تەنیا لە بەر ئەوەی ئافرەتە؟ ئایا لەو دەربرینەدا (دایك) کە شوناسی ئافرەتی هەیە بەو پەری بیّ ئیرادەیی‌و ساویلکەیی لاوازی لە ئاست پیاودا نیشان نەدراوە؟ ئەمە لە کاتیّکدا رەنگە ئیّمە پیّمان وابیّت ئەمە هەر تەنها رازندنەوەیەکی زمانەوانیەو دەربرینیّکی هونەری سادەیە لە چوارچیّوەی زماندا. بەلاّم ئەی پەیام‌و گوتارو ناوەرۆکی گۆرانیەکە؟ ئایا هەموو هونەریّك نابیّت پەیامیّکی هیۆمانیستانەی هەبیّت‌و هەر تەنها کار لەسەر دیوە سۆزداری‌و سیّکسیەکەی ئافرەت نەکات؟

هەڵبەتە تێڕوانینێکی کۆمەلآیەتی لەو شێوەیە بۆ ئافرەت لە هونەری گۆرانی کوردیدا  کە تارادەیەك لەهەموو قۆناغەکانی هونەری گۆرانی کوردی دەبینرێت، بەبۆچوونی من  دەرەنجامی  ئەو رەهەندە هزری‌و دنیابینیە فیکری‌و کۆمەلآیەتیەیە کە ئەقڵیەتی پیاوسالاری کورد هەیەتی‌و رەنگدانەوەی داخراوی کۆمەڵگا و زاڵبوونی مۆرکی ترادیسیۆنانەیە بە سەر ژیان‌و  کۆمەڵدا.  بە تایبەتیش لە سەردەمی رابردوودا.  بەلآم ئەمە بەو مانایە نییە کە لە ئێستادا هەمان شێوە تێروانین نەمابێت،  بە پێچەوانەوە رەنگە بچوك‌و  کەم ببێتەوە بەلآم لە فۆرمێکی تروبە دیوێکی تر ئەو بێ بەهاکردنە بە ئافرەت هە ر دەبینرێت.  بۆنموونە لە هونەری مۆدێرندا ئەگەر ئێمە سیناریۆو  کلیپی هونەری گۆرانیەکان تەماشا بکەین،  دەبینین لە بەشێکی هەرە زۆری کلیپی گۆرانی کوردیدا،  هەمان ئەو دیاردەیە هەست پێ دەکەین کە ئەو یش بە کەم تەماشاکردنی ئافرەتە.  بە بۆچوونی من کلیپی کوردی لە ئێستا دیا رترین پانتایی هونەرییە کە تیایدا درێژە بە و شێوە روانینەی پیاو ئەدات بۆ ئافرەت کە لە رابردوودا هەبوە. کاتێ سەرنج دەدەین لە کلیپی بە شێکی زۆری گۆرانی کوردیدا لە ئێستا، دەبینین کرداری چەند سەیرو سەمەرەوبێ نرخ بە ئافرەت دەسپێردرێت،  کارەسات لەوە دایە ئەو خۆشی بە بێ ئاگایی بێت یا بە ئاگای بە خۆشحالّیەوە وازی دەکات.  بۆنموونە یالە ( چێشتخانە)یە یا( سەوزەو میوە) ورد دەکات، یاخود بە هەنسکێکی زۆرەوە دەگرییێت،  ئایا هەموو ئەو کردارانە ئەوەندەی کەمکردنەوە لە ئافرەت‌و لاوازی‌و  بێدەسەلآتی ئەو نیشان دەدات. نیو ئەوەندە دیوە جوان‌و  میهرەبانیەکەی ئافرەت پیشان دەدات؟ جێگەی داخە کلیپی کوردی لە ئاستێکی یەکجار ناهونەری‌و  لاوازو  بێ بابەتی دایەو سیناریۆو  ئامازەکانی هیچ پەیام‌و  رەهەندێکی هیۆمانیستانەیان نییە.  بە دەر لە هەبوونی چەند کلیپێکی جوانی چەند هونەرمەندێك.  بەلآم چونکە ئێمە مەبەستمانە لە داهاتوو بە درێژی باسی( کلیپی هونەری گۆرانی کوردی) بکەین بۆیە لە ئێستادا بە پێویستی نازانین لە سەری بوەستین. بەلآم

مەبەستمان بو ئەو ئاستە کۆمەلآیەتیەی کە لە پشت روانینی پیاوە بۆ ئافرەت لە هونەری گۆرانی کوردیدا لە ئێستاشدا ئامارەیەکی بچوکی پێ بدەین.

بەبۆچوونی من هەرگیز ناکرێت شانازی بە هونەرێکە وە بکەین کەتیایدا لە پایەکانی مرۆڤبوون کەمدەکاتەوەو، مرۆڤ وەك بونەوەرێکی بێ بە هاو دەستەمۆ و ئامرازێك پیشان دەدات. چونکە هونەرو ئەدەبیات هەڵگری پە یامێکن‌و ئامانج تیایاندا دەرخستنی جوانیەکانی ژیان‌و بەرزکردنەوەو نرخاندنی ژیانی مرۆڤەکانە بە گشتی. چۆن دەبێت لە گۆرانیەکدا رووبەرووی دەیان دەستەواژەو چەمکی نەشیاو نامۆ ببینەوەو ئافرەت وەك رەگەزێکی لاوازو بێ ئیرادە وەسف بکات‌و بە بێ بەهایانەوە تێی بروانێت، کەچی ئێمەش گوێبیستی بین‌و هەست‌و سۆزمان پێی بجولێت‌و لەوە تراژیدی ترو کارەساتریش ئەوەیە شانازی پێوە بکەین بەوەی کەهونەرێکی جوانمان هەیە. . . .

-تێبینی/لەرۆژنامەی ئالآی ئازادی ژمارە(٨٩٥)لە ٦/٤/٢٠١١ بلآوکراوەتەوە.

# ناونیشانی شوێنه ( گشتی و تایبه‌تیه‌کان )
# له په‌راوێزی زمانی کوردیدا

پرۆسه‌ی داگیرکردنی کوردستان له‌لایه‌ن دوژمنانیه‌وه له‌پاڵ ئه‌وه‌ی پرۆسه‌یه‌کی سیاسی مێژووی دوورودرێژبوه، هاوکات کلتوری و په‌روه‌رده‌ی‌و سۆسیۆ_سیاسیش بوه. به‌ومانایه‌ی دوژمنانی کوردهه‌رته‌نها مه‌به‌ستیان خاك‌و جوگرافیاو نیشتمان نه‌بوه، به‌لکوهاوتای ئه‌وه‌ش مه‌به‌ستیان بوه له‌رێی ستراتیژیه تێکی درێژخایه‌ن‌و چرکه‌سیه‌تی مرۆڤی کوردوبونیادی سایکۆلۆژی‌و هزری مرۆڤی کوردیش وێران بکه‌ن. تاکوبچوکترین ماکوتایبه‌تمه‌ندی نه‌ته‌وه‌ی له‌مێژودا نه‌هێڵنه‌وه که کوردی وه‌ك نه‌ته‌وه‌یه‌ك بیّ بناسرێته‌وه بۆیه‌ده‌بینین مرۆڤی کورد به‌شێوه‌یه‌ك له شێوه‌کان له‌ده‌ره‌نجامی ئه‌وپرۆسه وێرانکاریه‌دا توشی جۆرێك له‌نامۆبون‌و دابرانی روحی‌و هزری بوه‌له‌ئاستی نه‌ته‌وه‌بیدا. سه‌رسامبونی مرۆڤی کوردبه هونه‌ری فارس‌و تورك‌و عه‌ره‌به‌کان، هیچ نیه جگه له‌و دابرانه روحیه‌ی که هه‌یه‌تی له ئاست کلتوری خۆیدا.

له‌دوای راپه‌رینه‌وه به‌ماوه‌یه‌کی که‌م ده‌بوایه یه‌کێك له‌ستراتیژه هه‌ره‌دیاره‌کانی ده‌سه‌ڵاتی کوردی بیناکردنه‌وه‌ی که‌سیه‌تی مرۆڤی کوردوگۆشکردنی بوایه به‌گیانی نیشتمانی‌و هه‌ست کردن به‌به‌رپرسیاریه‌تی‌و پابه‌ندبون به‌زمانی نه‌ته‌وه‌یی‌و کلتوری ره‌سه‌نی کورده‌واری خۆیه‌وه‌و ، به‌لایه‌نی که‌مه‌وه هه‌موونه‌وئاسه‌وارانه‌ی سربیاوه که‌به‌درێژای سی‌و پێنج ساڵ به‌به‌رده‌وامی به‌عس کاری له‌سه‌ر کردوو هه‌وڵی خاپورکردنی دا، که‌چی ئه‌مه نه‌ك هه‌رخه‌می سه‌ره‌کی‌و بنه‌ره‌تی ئه‌ودده‌سه‌ڵاته‌نه‌بوو، بگره به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك بیّ باکیش بوو که‌ئێستا له‌ژێرسایه‌ی ئه‌ودده‌سه‌ڵاته‌دا هه‌رچی کاڵاوکه‌لوپه‌ل‌و مۆدێلی خۆرئاواهه‌یه له‌سه‌رئاستی هه‌مووکایه‌کانه‌وه جێگه‌ی به‌بنه‌ما نه‌ته‌وه‌یه‌کانمان له‌ق کردووه له‌به‌ناوی ئازادی نوسین‌و ده‌ربرین‌و کارکردن‌و که‌رتی تایبه‌ت‌و ده‌یا ن شتی تر بواری بۆسه‌دان دیارده ره‌خساندوه

کەجگەلەسڕینەوەی بنەمانەتەوەیەکان هیجی ترنیە. من نازانم سەرکەوتنی یانەیەك بەهەوڵی دەیان یاریزانی عەرەب ج دەسکە وتێکی ناسیۆنالیستیە تاشانازی پێوەبکەین !

ئەمرۆ بەشێوەیەکی گشتیو لەسایەی دەسەڵاتی کوردیدا، کەتادوێنێ خوێنی سەدان هەزاررۆڵەی کوردی لەوشاخانەرشت لەپێناوهێنانەدی دەسەلاتێکی نەتەوەی دورلەستەمی نەتەوەی سەردەست، ژیانی ئێمە بەستایلێکە بجوکترین مۆرکو تا یبەتمەندی نەتەوەیی لەهەمووروێکەوە هەست پێ ناکەین لەپاڵ لاسایکردنەوەی کوێرانەی مۆدێلی ژیانی خۆرئاوا لەهەمووروێکەوە تاکی کوردی لە ئێستادا بچوکترین ماکوتایبەتمەندی نەتەوەی نەماوە مەگەرجارناجارێك لەجەژنی نەورۆزدا وەك سیناریۆیەکی کۆمەڵایەتی بێ مانا پۆشاکی کوردی بپۆشێ!!

یەکێك لەوبنەمانەتەوەیانەی ئەمرۆ بەشێوەیەکی ترسناك لەبەردەم هەرەشەی سرینەوەو نەماندایەزمانی نەتەوەی کوردیە. روەکانی وێرانکردنی زمانی کوردی لە ژێرسایەی دەسەڵاتی کوردیدا هەرتەنها لایەنێك نیە بەڵکولەچەندین روەوەیە. زمانی کوردی ئەمرۆ ئەگەر لەسەرێکەوە بەهۆی ستاندارنەبونیو پەیرەونەکردنی یەك شێواز لەرێنوسو رێزمانو رەچاونەکردنی لایەنی مۆرۆفۆلۆژیو سینتاکسو دەربرینو دەستەواژەی هەڵەو دارشتنی وشەی ناوازەوتێکدانی رێساکانی رێنوسو رێزمان لە قەیرانێکی گەورە دابێت، ئەوا لەسەرێکی ترەوە بەهۆی هەلومەرجی ئەمرۆی نوسینی کوردیو ئەوگەرەلاوژێیەی میدیای کوردی لەواقیعی ئەمرۆماندا وهاوکات نەبونی هیج رێساو سانسۆرێك لەلایەن وەزارەتی رۆشەنبیریەوە بەمەبەستی رێکخستنو یەکخستنی رێساکانی نوسینو بلاو کردنەوە، ئەوەندەی تر زمانی کوردی لەدۆخێکی رۆشنبیری کوشندەدایە. وێرای ئەوەی کەلەزۆرزەمینەو شوێنگەدا زمانێکی دیکەی جیالەزمانی کوردی قسەی پێ دەکرێت بۆنمونە وەك فارسی.

لەراستیدا یەکێك لەوئامرازانەی بەردەوامی بەمانەوەوزیندوەتی زمان دەدات لەبونیادی کۆمەڵگادا، خستنەگەری زمانو بەرجەستەکردنیەتی

لەبواری دیالۆگ‌و پەیوەندی ئاسایی رۆژانە و لەهەموشی گرنگترپاراستنی ئەودەستەواژەو جەمك‌و وشەو دەربرینانەیە کەمۆرکێکی رەسەنیبوون‌و رەهەندێکی مێژوویانەیان هەیە، لەوروانگەیەشەوەیە کەزمان دەتوانێ پارێزگاری لەمانەوەو بەردەوامی خۆی بکات. بەدەربرینێکی تر بنەماکانی بەزیندووهێشتنەوەی زمانی هەرنەتەوەیەك لە پرۆسەی بەردەوامی مێژوییدا خودی زمانەکە خۆیەتی نەك شتێکی تر، بێگومان کاتێ زمانی هەرنەتەوەیەکیش بەرەوسرینەوە کاڵبونەوە دەچێت ئیدی مەترسی هەرەگەورەو ترسناك دێتە ئاراوە ئەو یش لەنێوچونی نەتەوەیە کەهیچ ئامرازوو فاکتەرێکی تر ناتوانن پارێزگاری لەمانەوەی نەتەوەبکە ن، بەتایبەتیش لەهەلومەرجێکی وەك ئەمرۆماندا کەتانەندازەیەکی وا نەتەوەکان تێکەل بەیەکتری بوونە خەریکە هیچ ناسەوارو تایبەتمەندیەکی نەتەوەی لەنێوانیان دانامێنێت بەهۆی گلۆبالیزمەوە، بەلاّم ئەوە بەومانایە نیە کەئیدی زمانی ستانداری نەتەوەش دەچێتە خانەی ئەوهاوکێشەوە بەپێچەوانەوە بەلکو بۆنەتەوەیەکی بێ قەوارەو خاکی وەك ئێمە زمان نەك هەر تەنها رەهەندێکی کۆمەلایەتی هەیە بکرە ماناومەغزایەکی سیاسی بێسنوریشی هەیە. جونکە تاکەبنەمای ناسینەوەی سیمای نەتەوەییمانە لەهەلومەرجی ئەمرۆماندابۆیە پارێزگاری کردن‌و پاراستنی نەك هەر ئەرکێکی نەتەوەیە بەلکو مۆرالی وسیاسی‌و فکریشە هاوکات دەسەڵاتی کوردی دەبێ بەیاسا بەرجەستەی بکات وبەدەر لەو زمانە نەتەوەیە رێگە نەدات هیچ زمانێکی تر مۆرکی فۆرمیبون وەرگرێ لەکۆمەلگادا، بەلاّم پرسیاری سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە ئاخۆ زمانی کوردی لەهەلومەرجی ئەمرۆماندا بەوشێوەیە گرنگی‌و بایەخی خۆی پێ دەدرێت لەژێرسایەی دەسەلاّتی کوردیدا یاخود نا؟

بەدەربرینێکی تر زمانی کوردی لەچوارچێوەی گوتارو هەلومەرجی ئەمرۆی رۆشنبیریمان لەکوێوەدایە ؟ئایا وەك پێویست لەدیالۆگ‌و دەربرین‌و ناوونازناووشوناسی شوێن‌و تابلۆو تایتلی جێگە گشتی‌و تایبەتیەکان بەرجەستە کراوە؟جێگەی داخە زمانی کوردی ئەمرۆلەژێرسایەی دەسەلاّتی

کوردیدا لەوپەڕی وێرانکاریو بێ بایەخیدایە وەك کۆی تایبەتمەندیە نەتەوەیەکانی دیکەمان بەرادەیەك ئەگەر زمانی کوردی بۆماوەیەکی تر بەوشێوازە بمێنێتەوە ئیدی شتێك نامێنێتەوە بەناوی زمانی راستەقینەو نەتەوەیی کوردی، چونکە وەك وتمان مانەوەوبەردەوامی زمان بەندە بەبەردەوامیو پراکتیزەکردنی لەزەمینەی واقیعدا.

لەراستیدا گوزەرکردنێکی خێرا، بەشەقامو کوچەوکۆلانە سەرەکیو لاوەکیەکانی هەولێری پایتەخت بە نمونەو سەرنج دانمان بۆ هەموو ئەو ناونیشانو تابلۆو ناوونازناوو شوناسانەی، شوێنە گشتیو تایبەتیەکانو هوتێلو چێشتخانەو بازارگەونێوەندە بازرگانیو ئابوریەکان، بەتەنها بەسن بۆئەوەی بزانین لەبەردەم چ وێرانکردنێکی زمانی کوردیداین لەژێرسایەی دەسەڵاتی کوردی خۆیدا.

بەرادەیەکی وا کەمرۆڤ واهەست دەکات ئێرە پایتەحتی خۆی نیەو شارێکی تری بیانیە، ئەگینا ئەوهەموو ناوونازناوە نامۆو نانەتەوەیانە نابینرێن، ناونانی شوێنەکان بە(رۆتردام_استنبۆل _میونیخ_ برشەلۆنە_ بلیبۆس_هۆم_راکان_پلازا_پراغ_چیك_بۆن_تاران_ژنیف.... تد) و دەیان ناوی نانەتەوەیی سەیروسەمەرەی تری بێ مانا، ئاماژەیەکن بۆکالبونەوەو نەمانی ناوە راستەقینەیە کوردیەکان، هاوکات کەمتەرخەمیو بێدادیو هەست نەکردن بە بەرپرسیاریەتی نەتەوەی لەلایەن دەسەلاتی کوردی دەگەیەنێت، چونکە ناکرێت لە ژێرسایەی ئەودەسەڵاتەدا بەناوی سەردەمی گلۆبالیزمو ئازادی ژیانو مافی هاوڵاتیبون، زەمینەیەك برەخسێنین بۆکاڵکردنەوەوسڕینەوەی بونیادی زمانی نەتەوەییمان. ئایا لەهیچ کۆمەڵگایەکی دنیادا بەورادەیە بێ بەرپرسیاریەتی هەیە بەرامبەر زمانی راستەقینەو نەتەوەی خۆیان؟ ئایا لەوڵاتی تورکوفارسو خۆرئاوایەکان بەهەمان شێوە تایتلی کوردی دەبینین بۆ ناونانی شوێنەکان؟ وەك ئەوەی لەکۆمەڵگای ئێمە دەبینرێت؟ئەمە چ مانایەکی هەیە جگە لەرۆحی خۆبەکەم زانینو زەلیلیو ژێردەستەی لەئاست نەتەوە شۆفێنیەکانی دیکەی سەردەستدا؟ئەگەر پاساوی وێرانکردن وپرۆسەی تێکدانو شێواندنی زمانی

کوردی تادوێنی نەبوونی ئازادیو ژێر دەستەی دوژمنان بوبێت، ئەی لەهەلومەرجی ئەمرۆماندا پاساوجیە؟ هیچ دەسەلاتێك هەیە هێندە بێباك بێت بەرامبەربە زمانی نەتەوەی خۆیو زەمینەی ئەوەبرەخسێنێت کە وشەو دەستەواژەی زمانی نەتەوەی دوژمن وسەردەشت بکرێتە ناووتایتلی شوێنە گشتیو تایبەتیەکان ؟ئایا لەبری هەمووئەوناوەسەیروسەمەرەونانەتەوەیانە ناکرێ، ناووشوناسی کوردی بەرجەستە بکرێن ؟ئایا ناونانی شوێنەکان بەپەیفیو جوانو رەسەنی کوردی کەدەلالەتی مێژووی وشۆرشگێری نەتەوەی بگەیەنێت جوانترو شیاوترو پیرۆزترنیە لەوجۆرە ناونیشانانە! دەپرسین ناونانی شوێنەکان بە(زمناکۆ_ ژیلوان_ ئارامکۆ_ ئارارات_ زاگروس_ کارۆخ- هندرێن_ زۆزك_ سورێن _کۆسار-سارا_ ئاسۆس_ کۆسرەت_ هەرمێن_ دابان_ گڵەزەرد ). . . . . تد

هەزاران جارشیاوترو ئستاتیکی ترو مۆزیکی تر نیە، لەوناوە بێمانایانە. بەبۆچونی من شێوازی ناونانی شوێنەکان، بەوستایلە دیاریکراوەی کە هەیە بەرلەوەی دیاریکردنی تایتلێك بێ بۆشوێنەکان، هە ولێکە بۆتێکدانو شێواندنو لەناوبردنی پەیفی رەسەنی کوردی، لەژێرسایەی دەسەلاتی کوردی خۆیدا، بەناوی مۆدێرنەبونو کرانەوەی کۆمەلگاوگلۆبالیزمو تیکەڵبونی کلتوروزمانی نەتەوەکان. بەلاَم دەپرسین هیچ دەسەلاتێك هەیە هێندە بێباك بێت بەناوی تێکەڵبونی زمانو کلتوری نەتەوەکانی تر، بوار بۆسرینەوەی بنەمانە تەوەیە کانی خۆی برەخسێنێت. بە تایبەتیش لە کۆمەلکایەکی وەك کۆمەلگای کوردیدا کە تاکو ئێستا هیچ قەوارەو دەسەلاتێکی نەتەوەی سەربەخۆی نیە.

بێگومان ئێمە لەوروانگەیەوە لەبەرامبەر هەبونی دیاردەیەکی لەوشێوەیە دەسەلاتی کوردی بەبەر پرسیار دەزانین، جونکە رێکخستنو دیاریکردنو مەرجی دانانی ناووشوناسو تابلۆوتایتلەکان بۆ ئێوەندە بازرگانیو ئابوریەکان پێویستە لەرێی لیژنەیەکی دیاریکراوەوە، کەلەلایەن وەزارەتی رۆشنبیریەوە راسپاردرابێت، رێك بخرێت، بۆ ئەوەی هەریەکیّو بە ئارەزوو، خواستو تێگەیشتنی خۆی ناونیشانێك هەلّنەبژێرێتو

سەرەنجامیش ببێتە هۆی لەناوبردنو سڕینەوەی وشەودەستەواژەی زمانی نەتەوەییمان. چونکە بەردەوام بوونی ئەم پرۆسەیە بەو شێوەیەی کە هەیە بێگومان سەرەنجام دەبێتە هۆی کاڵبونەوەو نەمانی زمانی نەتەوەی کوردی کە ئەمەش مەرامو مەبەستی سەرەکی دوژمنانی گەلەکەمانە.

رەنگە کەسانێك بۆچونیان وابێت، کەناکرێ لەهەلومەرجی ئەمرۆماندا، کەسەردەمی پێشکەوتن و کرانەوەی گەلانو بەیەکداداچونی کلتورو زمانو فەرهەنگی گەلانە، سنورێك لەبەردەم رەگەزە نەتەوەیەکان دابنێینو بەناوی‌ناسیۆناڵیبونەوە، زەمینە لەبەردەم ئەوتێکەڵبونە نە هێڵینەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەوەی دەبینرێت لەبارەی زمانی کوردیەوە، کەمتەرخەمیو گوی نەدانو هەست نەکردن بەبەرپرسیاریەتی نەتەوەیە، لە لایەن هەموومان بەگشتیو دەسەڵاتی کوردیش بەتایبەتی، چونکە هیچ پاساوێك لەوەدانیە لەپایتەختی هەرێمی خۆمانو لەژێر سایەی دەسەڵاتی کوردیدا، ئەوهەمووناوەنانەتەویانە ببینرێن، ئێمە کە فەرهەنگێکی زمانەوانیو فەرهەنگی دەوڵەمەندمان لەبواری زماندا هەیە، کەپڕە لەوشەو دەستەواژەی رەسەنی نەتەوەی، چ مانایەکی هەیە کەسێك چێشتخانە یاهوتێلەکەی بەناوی (میونیخ- یا زوریخ) بکات !!!!

تێبینی / بە سێ بەش لە رۆژنامەی (رووبەر) بڵاوکراوەتەوە. . .